بەرکولێکی کار و چالاکی و ڕووداوەکانی



**2017 - 1961**


نووسینی: عـەلی بـــاپیر

چاپی یەکەم ١٤٣٩ز- ٢٠١٨ك

١٤٩ لاپـــەڕە

١٧* ٢٤ سـم

بابـەت : ژیاننامە

تیراژ : ١٠٠٠ دانە

لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتیەکان - هەرێمی کوردستان

ژمارە سپاردنی ( ٣٧٠ ) ی ساڵی ٢٠١٨ پێدراوە

**خـەتی بـەرگ :** نـــەوزاد کۆیـــی

**دیزاینی ناوەوە و بەرگ :** زەردەشت کاوانی



www.alibapir.net

ameer.maktab@yahoo.com




/AilBapir



/AilBapir

/MediaAmeerOffice

بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

﴿وَٱذْكُرُواْ نِعْمَةَ ٱللَّهِ عَلَيْكُمْ وَمِيثَٰقَهُ ٱلَّذِى وَاثَقَكُم بِهِۦٓ إِذْ قُلْتُمْ سَمِعْنَا وَأَطَعْنَا ۖ وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ عَلِيمٌۢ بِذَاتِ ٱلصُّدُورِ ﴿٧﴾﴾ المائدة -٧-

## پێشکەش بێ

به هەرکەسێك کە توند توند دەست بەکات و تەمەنییەوە دەگرێ و، ناهێڵێ هیچ تاو (لحظة)یەکی بێهوودە لەدەست بچێ، نەك بەدەم خافڵان و بێ ئاگاییەوە، عومری بەفیڕۆ بڕوات و سەرەنجام:

دەستی لەبنی هەمبانەی بەتاڵەوە دەربچێ!

## پێشەکیی

الْحَمْدُ للهِ نَحْمَدُهُ وَنَسْـتَعِينُهُ، وَنَسْتَغْفِرُهُ، وَنَعُوذُ بِاللّٰهِ مِنْ شرُورِ أَنْفُسِـنَا، وَمِنْ سَيئَاتِ أَعْمَالِنَا، مَنْ يَهْده اللهُ فَلاَ مُضِـلَّ لَهُ، وَمَنْ يُضلِلْ فَلاَ هَادِيَ لَهُ، وَأَشْهَدُ أَن لاَ إِلَهَ إلاّ اللهُ وَحْدَهُ لاَ شَرِيكَ لَهُ، وَأَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّداً عَبْدُهُ وَرَسولُهُ.

﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱتَّقُواْ ٱللَّهَ حَقَّ تُقَاتِهِۦ وَلَا تَمُوتُنَّ إِلَّا وَأَنتُم مُّسۡلِمُونَ ١٠٢ ﴾ آل عمران

﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ ٱتَّقُواْ رَبَّكُمُ ٱلَّذِي خَلَقَكُم مِّن نَّفۡسٖ وَٰحِدَةٖ وَخَلَقَ مِنۡهَا زَوۡجَهَا وَبَثَّ مِنۡهُمَا رِجَالٗا كَثِيرٗا وَنِسَآءٗۚ وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ ٱلَّذِي تَسَآءَلُونَ بِهِۦ وَٱلۡأَرۡحَامَۚ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ عَلَيۡكُمۡ رَقِيبٗا ١ ﴾ النساء

﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱتَّقُواْ ٱللَّهَ وَقُولُواْ قَوۡلٗا سَدِيدٗا ٧٠ يُصۡلِحۡ لَكُمۡ أَعۡمَٰلَكُمۡ وَيَغۡفِرۡ لَكُمۡ ذُنُوبَكُمۡۗ وَمَن يُطِعِ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ فَقَدۡ فَازَ فَوۡزًا عَظِيمًا ٧١ ﴾ الأحزاب

أَمَا بَعد:

فَإِنَّ أَصْدقَ الَحديث كَلامُ الله وَخَيرَ الهَدْي هَديُ مُحَمّد صَلى اللّٰه عَليهِ وَسلَم وَشَرَّ الأُمورِ مُحْدَثاتُها، وَكُلَّ مُحدثةٍ بِدْعة، وَكُلّ بِدْعةٍ ضَلالة، وَكُلَّ ضَلالةٍ في النّار.

**بەڕێـــزان!**

بەباشم زانی بەمەبەستی بەرچاو ڕوونیی زیاتری خوێنەران و، باشتر ئاشنابوونیان بەژیان و بەسەرهاتی بەندە، ئەم (بەرکۆڵ)ە لەبارەی کاروچالاکیی و ڕووداو و وێستگە سەرەکییەکانی ژیانم و بەرهەمە فیکرییەکانمەوە بنووسم.

کە بێگومان بۆخۆشم ئاوڕدانەوەو چاوپێداگێڕانەوەیەکی کۆی بەسەرهات و سەرگوزشتەی ژیانمەو، وێڕای دەرس و پەند وەرگرتنی زۆرو جۆراو جۆرم، مایەی یادکردنەوەی چاکەو بەخششەکانی خوای بە بەزەیی و بەخشەریشە لەژیانمدا.

هەڵبەتە لەم کتێبەدا کە بەهەرسێك زمانی: کوردیی و عەرەبیی و ئینگلیزییە[1] - وەك لەناوونیشانەکەیەوە دیارە - تەنیا کاروچالاکیی و ڕووداو و وێستگە گرنگەکانی ژیان و بەسەرهاتی بەندە، تۆمار کراون، نەك سەرجەم کاروچالاکییەکان و تێکڕای وردەکارییەکانی بەسەرهاتی ژیانم، کە کتێبی: (چەند مەڵۆیەك لەخەرمانی تەمەنم)ی لە نووسینی خۆم، بۆ تەرخان کراوەو، هەتا ئێستا تەنیا بەرگی یەکەمی دەرچووە، کە لەساڵی: (١٩٦١) تاکو: (١٩٩١)ی گرتۆتە خۆی.

**دەشتوانین لەوبارەوە ئاماژە بەچەند شتێك بکەین، کە نەگونجاوە لەم بەرکوڵەدا تۆمار بکرێن:**

١- جگە لەوانەی لەم بەرکولەدا ئاماژەمان پێداون، چەندان سەفەرو سەردانی دیکەم لەنێوخۆو دەرەوەی وڵاتدا ئەنجام داون، چ سەفەری سیاسیی و حیزبیی، چ سەفەری خێزانیی و کۆمەڵایەتیی، بۆ وێنە: سەفەرکردنی چەند جارێك بۆ هەرکام لە: ئێران و ئوردن و تورکیا.

---

(١) کوردیی و عەرەبییەکە خۆم نووسیومن و، (د. محمد) کوڕی گەورەشم سەرپەرشتیی تەرجەمەی کردوە بۆ زمانی ئینگلیزیی، خوا بەباشترین شێوە پاداشتی بداتەوە.

٢- وێڕای ئەو چالاکییە فیکرییانەی کە باسمان کردوون، دەیان وتاری: فیکریی و سیاسیی و کۆمەڵایەتیی دیکەشم، لەدەیان کۆڕو کۆبوونەوەی حیزبیی و جەماوەرییدا پێشکەش کردوون، کە بەشێکیان نووسراونەوەو بوونەتە کتێب و نامیلکەو چاپ کراون و، زۆربەی هەرەزۆری زنجیرەی: (بابەتە هەنووکەییەکان) لەو جۆرەن.

٣- چەندان هەوڵی صوڵح و پێکهێنانەوەی سیاسیی و خێزانیی و کۆمەڵایەتییم داون، لەزۆرێك لەناوچەکانی هەرێمی کوردستاندا، کە هەیانبووە بەتەواویی ئامانجی خۆی پێکاوەو، هەشیانبووە نیوە چڵ بووە، یان بێ ئاکام بووە.

٤- سەدان سەردانی سیاسیی و کۆمەڵایەتییم ئەنجامداون و، پێشوازییم لەسەدان شاندو سەردانی سیاسیی و ڕێکخراوەیی و کۆمەڵایەتیی کردوە، لە خەڵکی بیانیی و خۆماڵیی، لەسەرجەم توێژەکان.

شایانی باسیشە وردو درشتی ئەم کتێبە هی خۆمە، هەرچەندە بەشێوەی قسەکردنی ڕاستەوخۆی من دانەڕێژراوە، بەمەبەستی خۆ دوورگرتن لەقسەکردنی ڕاستەوخۆ لەبارەی خۆمەوە.

١٣/ڕەبیعی دووەم/١٤٣٩ك

٢٠١٧/١٢/٣١ز

هـەولـێـر



## نــاو وڕەچەڵەکی

ناوی سیانیی: (عەلی باپیر وەتمان) ئنجا ڕەچەڵەکی هەتا دەگاتەوە سەر فەقێ ئەحمەدی دارەشمانەیی، بەم شێوەیە:

عەلی باپیر وەتمان ماماغا وەتمان ئەحمەد حەمەداغا پیربوداغ.. میراودەل. فەقێ ئەحمەدی دارەشمانە.

واتە: لەلای بابیەوە لەعەشیرەتی میراودەلییەو، دایکی بابیشی (مێر) لەعەشیرەتی وەستا خاڵەیە.

لەلای دایکیشیەوە: دایکی: مێر ڕسو برایم گۆران" لەعەشیرەتی گۆرانەو، دایکی دایکیشی (بەس) لەعەشیرەتی مەنگوڕە.

لە هاوینی ساڵی (١٩٦١)ی زایینی لە گوندی (کەنجاڕە)ی سەر بەناحیەی (سەنگەسەر)ی سەر بەقەزای (پشدەر) لەدایك بووەو، پێنج شەش ساڵی تەمەنی پێش چوونە قوتابخانەی لە گوندی (کەنجاڕە)و پاشان (بەستەستێن) گوزەراندوە.



## ٢ چوونی بۆ قوتابخانە

لە ساڵی (١٩٦٧)دا چۆتە قوتابخانەی سەرەتایی (سەنگەسەر) و پۆلی یەکەمی بڕیوە، پاشان بەهۆی ماڵ گواستنەوەدیانەوە لە (بەستەستێن)ەوە بۆ (گردی تلێ)و، پاشان بۆ شارۆچکەی (ڕانیە)، هەرچەندە پۆلی دووەمی سەرەتایی - لە ساڵی ١٩٦٨- لە ماڵی پووری، ماڵی (ئەحمەداغای کەستانە)و لە شارۆچکەی (چوارقوڕنە) خوێندوەو یەکەمیش بووە، بەڵام بەهۆی نەهێنانی



ئەمری نەقڵکرانی لە(سەنگەسەر)ەوە بۆ (چوارقوڕنە)، ئەو ساڵەی فەوتاوەو، پاش ماڵ گواستنەوەیان بۆ (ڕانیە) لە ساڵی (١٩٦٩)دا دیسان چۆتەوە پۆلی دووەمی سەرەتایی و، هەتا ساڵی (١٩٧٣) پۆلی شەشەمی سەرەتایی تەواوکردوەو، هەموو پۆلەکانی بە پلەی یەکەم بڕیوە.



## چوونی بۆ پەیمانگای ئیسلامیی لە (ڕانیە)و تەواوكردنی لە (سلێمانیی)



لە ساڵی (١٩٧٤)دا هەر لە (ڕانیە) چۆتە (پەیمانگای ئیسلامیی) لەپۆلی یەكەم و بەپلەی یەكەم دەرچووەو، ساڵی (١٩٧٥)یش بەهۆی ڕووخانی شۆرشی ئەیلوولەوە ساڵێكی خوێندنی فەوتاوە و، لە ساڵی (١٩٧٦)دا لە شاری (سلێمانی) چۆتە پۆلی دووەمی نێوەندی (پەیمانگای ئیسلامیی)و هەتا ساڵی (١٩٨٠) لە سلێمانی خوێندوویەتی و، پۆلی شەشەمی ئامادەیی ئیسلامیی تەواوكردوە و، هەموو پۆلەكانی بە پلەی یەكەم بڕیوە و، لە پۆلی شەشی پەیمانگای ئیسلامیی "ئامادەیی ئیسلامیی" كۆی گشتی نمرەكانی (٩٠) بووە.



## چوونی بۆ زانكۆ



لە ساڵی (١٩٨٠-١٩٨١)دا چۆتە كۆلێژی (فقه) لە شاری (نەجەف)، كە هەرچەندە بەهۆی بەرزیی نمرەكانییەوە دەشیتوانی بچێتە هەركام لە كۆلێژی (الشریعة) و (آداب)ی بەغدا، بەڵام كۆلێژی (فقه)ی نەجەف هەڵدەبژێرێ، كە خاوەن پلە كەمەكانی وەردەگرتن، بە مەبەستی شارەزابوون لە فیكرو مەزهەبی شیعە.



## ٥ جووتیاریی و کرێکاریی کردن

شایانی باسیشە لە هەموو ئەو قۆناغانەی خوێندنیدا، هاوینان لەگەڵ بابیدا سەرگەرمی کاری جووتیاریی و کشتوکاڵ و کرێکاریی بووە، گەلێك جار لە گەرمەی خوێندنیشیدا ڕۆژانی پێنجشەممەو جومعە کرێکاریی کردوە، تاکو قورسایی زیاتر نەخاتە سەر ماڵەوەیان، کە باری ئابووریی و گوزەرانیان باش نەبووە، ئەو پارەیەش کە بەهۆی کرێکارییەوە پەیدای کردوە، زۆر جاران داویەتە دەست بابی و، هەندێك جاریش جگە لە کەمێکی کە بۆ مەسرەفی ڕۆژانە بەکاری هێناوە، بۆ کڕینی کتێب خەرجی کردوە، چونکە هەر لە سەرەتای خوێندنیەوە لە پۆلی یەکەمی سەرەتاییەوە، خولیای موتاڵاو کتێب خوێندنەوە بووە!





## سەرەتاو دەستپێکی نوێژو ڕۆژوو و طاعەت

لەڕووی تاعەت و دیندارییشەوە، هەر لە پۆلی چواری سەرەتاییەوە نوێژی کردووە، هەر لە پێنج شەش ساڵیشەوە کەم و زۆر ڕۆژووی گرتووە، پاش دەستکردنی بە خوێندن لە (پەیمانگای ئیسلامیی)یش و تێکەڵیی کردنی لەگەڵ مامۆستایانی ئایینی و ئەهلی عیلم، بە جیددیی چۆتە نێو دنیای تاعەت و دینداریییەوە، هەر لەو سەرەتایەشەوە دەستی کردوە بە بانگەواز و ئامۆژگاریی کردن و دەرس پێگوتنی خەڵکی نزیك و دەوروبەری خۆی و هۆشیارکردنەوەیان، هەر لە باب و دایك و خوشك و براو خزمانەوە بگرە، هەتا دەرو دراوسێ و دۆست و برادەرو هاوەڵانی قوتابخانەی.



## چوونی بۆ سلێمانیو درێژەدانی بە خوێندنی نێوەندییو، پاشان ئامادەیی لە (پەیمانگای ئیسلامیی) داو، گەشەکردنی لەڕووی فیکریی و ڕووحییەوە

لە سۆنگەی هەلومەرجی سیاسییو فیکریی ئەوساوە، کە ململانێیەکی توند لەنێوان فیکری ئیسلامییو بیرۆکە نەیارەکانیدا بەتایبەت مارکسیزم و کۆمۆنیزم، هەبوو، لەڕووی فیکرییو ڕووحییەوە گۆڕانکارییو گەشەکردنێکی زۆر بەخۆیەوە دەبینێ و، بە خەستی دەکەوێتە نێو جیهانی خوێندنەوەو بیرکردنەوەو ڕامان لەلایەك و، لەلایەکی دیکەوە پرسیارکردن و وتوێژو شەڕەقسە (مجادلة)وەو، ئەمەش هۆکاری سەرەکی دەبێ بۆ گرنگی دانی زیاتری بەلایەنی ئیمانیی و



ڕووحیی، چ لەڕووی خواپەرستییەکانی وەك نوێژو ڕۆژووی سوننەتو زیکرو ویردو قورئان خوێندنەوە، چ لەڕووی موتالاَکردنی ئەو کتێبو سەرچاوانەوە کە باسی تەزکیەی نەفس و پارێزکاریی و ڕەوشت و ئاکار دەکەن وەك: (إحياء علوم الدين)ی (أبوحامد الغزالي) و (إيقاظ الهمم في شرح الحكم)ی (ابن عجيبة) و (الرسالة)ی (القشيري) و...هتد، لەکۆتا قۆناغی ئامادەییشدا لەساڵی ١٩٨٠دا لەبەرکردنی قورئانی بەرزو بەپێزی تەواوکردوە.



## ٨ وازهێنانی لەخوێندنی زانکۆو قاچاغ بوونی لەڕژێم و، چوونی بۆ کوردستانی ئێران

لە کۆتایی ساڵی (١٩٨١)دا، کە دەچێتەوە (نەجەف) بۆ درێژەدانی بەخوێندنی زانکۆ لە کۆلێژی (فقه) بۆ ساڵی دووەم، لەلایەن هاوڵێکی هاوپۆلییەوە، "بەناوی: (صبيح إلياس - أبو جهاد) کە ئێستاش لەژیاندایە و لە بەغداد نیشتەجێیە" ئاگادار دەکرێتەوە، کە ڕژێمی بەعس بڕیاری دستگیرکردنی داوە، بۆیە یەکسەر نەجەف و کۆلێژەکەی بەجێدەهێڵێ و، دەگەڕێتەوە بۆ ڕانیەو، لەوێش دوای ئەوەی (مام صالح)ی (موختار) دڵسۆزانە ئاگاداری دەکاتەوە کە لەلایەن دائیرەی (ئەمن)ەوە داوای لێکراوە کە ماڵو ناوونیشانی ئەویان پێ بڵێ، بە مەبەستی گرتنی، پاش چەند ڕۆژێك خۆحەشاردان، بەردو ئێران

دەچێ و، بۆ ماوەی شەش مانگ لە کوردستانی ئێران دەمێنێتەوەو، لە دێی (بەردەرەش)ی نێوان (سەردەشت) و (بانە) لە حوجرە و قوتابخانەی (مامۆستا مەلا موحەممەدی عەزیزی بەردەڕەشیی) سەرگەرمی خوێندن دەبێ، لەو ماوەیەشدا خۆی فێری زمانی فارسی دەکات و، لە هەوڵدان بۆ بەهێزکردنی لایەنی فیکریی‌و ڕووحیی و، لەسەر بانگەوازو قسەی خێر لەگەڵ مامۆستا و فەقێیەکان بەتایبەت و، خەڵکی دیکەدا بەگشتی، بەردەوام دەبێ و، لەو ماوەیەشدا کۆمەڵێك وتووێژو موناقەشەی لەگەڵ کەسانێکی عەلمانیی سەربە حیزبە لائیکەکانی کوردستانی ئێراندا دەبن، کە سێ لەو وتووێژانە: (سەلماندنی بوونی خوا) و (سۆزی نەتەوایەتیی) و (دادگەریی کۆمەڵایەتیی)یان لێ پەیدا دەبن.

هەروەها هەر لە میانەی مانەوەی لە ئێرانو هاموشۆی بۆ کوردستانی عێراقدا، چەند وتووێژو شەڕە قسەیەکی دیکەشی لەگەڵ ژمارەیەك لە بەرپرسانی مارکسیستی ئەوسای یەکێك لەلایەنە سیاسیەکانی کوردستانی عێراقدا دەبن، کە دواتر لەدووتوێی: (ئیسلام ئیسلامە، نە ئایدیالیزمە، نە ماتریالیزم) و (ئیسلام وریاکەرەوەیە نەك تریاك)دا بەرجەستە بوون، کە دواتر هەموویان لە کتێبی (دەبەرێك ڕاچوونی ئیسلامو ڕێچکان)دا کۆکرانەوەو چاپ کران، جگە لە (سۆزی نەتەوایەتیی) کە کتێبێکی سەربەخۆیەو (دادگەریی کۆمەڵایەتیی) کە ئێستاش هەردەستنووسە.

## ٩ چوونی بۆ شاری تاران



دوای شەش مانگ مانەوە لە کوردستانی ئێران، لەساڵی (١٩٨٢)دا بەرەو (تاران)ی پایتەختی ئیران بەڕێدەکەوێ، بەنیازی درێژەدان بە خوێندنی زانکۆ، بەڵام پاش شەش مانگ مانەوە، هەوڵەکانی بێهوودە دەبن و، لەساڵی ١٩٨٣دا دەگەڕێتەوە کوردستانی عێراق و، لەڕێی چەند دۆست و برادەرێکەوە کێشەی گەڵ ڕژێمی بەشێوەیەکی کاتیی بۆ چارەسەر دەکرێ و، سەرەنجام لە بەڕێوەبەرایەتیی ئەوقافی هەولێر ئیمتیحانێکی پێشنوێژیی و وتاربێژیی (الإمامة والخطابة) دەدات و، بەپلەیەکی زۆر باش دەردەچێ و، لە ١٩٨٣/٥/١٤ لە مزگەوتی (نۆڕسی) لە (ڕانیە) تەعین دەبێت، بەشێوەی (الإنتداب) لەجیاتی خزمەتی سەربازیی و، کێشەی سەربازیی نەکردنیشی چارەسەر دەبێ.



## نووسینی یەکەمین کتێب و چاپکردنی




لە هەمان ساڵی (١٩٨٣)دا، یەکەمین کتێبی دەنووسێ بەناوی (پوختەیەك دەربارەی ئیسلام) کە بریتیە لە تەفسیری سووڕەتی (الفاتحة) و لە ساڵی (١٩٨٤)دا لە چاپخانەی: (شفیق)، لە بەغداد چاپ دەکرێ.



## سەفەرێك بۆ ئێران بەنوێنەرایەتیی بزووتنەوەی پەیوەندیی ئیسلامیی

لەهەمان ساڵدا بەنوێنەرایەتیی (بزووتنەوەی پەیوەندیی ئیسلامیی- حركة الرابطة الإسلامية) کە هەتا ئەوکاتە هەر لەشێوەی ڕێکخراوی نهێنیی (تنظيم سرّي)دا بوو، لەڕێی مەریوانەوە سەردانی ئێران دەکات بەمەبەستی بینینی (حاجی شێخ عبدالقادری سۆتکەیی)، کە کەسایەتیی دووەمی (لەشکری ئیسلامیی) بووە، لەشاری کەرەج دانیشتوە، پاش لێدران و چەککردنیان لەلایەن یەکێتی نیشتیمانییەوە، مەبەستیش لەسەردانەکە: سەرەخۆشیی لێکردنی و هاوخەمیی دەربڕین، بەبۆنەی کوژرانی کوڕێکییەوە، ڕاوێژکردن بووە.



## یەکەمین هاوسەرگیریی و نیشتەجێ بوونی لە گوندی (سەرسیان)

لە مانگی یەکی (١٩٨٤)دا ژیانی هاوسەری پێکدێنێ لەگەڵ هاوسەری کۆچکردووی (ڕوخسار ئیبراهیم ماماغا) "خوا لێی خۆشبێ"داو، پاش مانگێك دوای گواستنەوەی خێزانی، ماڵی بابیو شارۆچکەی ڕانیە بەرەو گوندی (سەرسیان) بەجێدەهێڵێ، زیاتر لەبەر هۆکاری ئەمنیی.



## ماڵ گواستنەوەی بۆ گوندی (گەڵوو) و مەلایەتیی کردن

پاش نیزیك ی دوو ساڵ مانەوە لە (سەرسیان) و دوای چەند هەوڵێکی ڕژێم بۆ گرتنی، لەکۆتایی ساڵی (١٩٨٥)دا ماڵەکەی باردەکات بۆ گوندی (گەڵووی ماخۆبزنان) و بە سیفەتی (مەلای گوند) لەوێ نیشتەجێدەبێ و دەوری دوو ساڵ دەمێنێتەوەو، پاشان کە ڕژێم زیاتر هەوڵەکانی بۆ دەستگیرکردنی چڕدەکاتەوەو فشاریش دەخاتەسەر بەرپرسانی سەر بە ڕژێمی ناوچەکە، ناچاردەبێ خۆیو خێزانی ماوەی چەند مانگێك لەساڵی (١٩٨٧)دا بکەونە حاڵەتی خۆحەشاردان (إختفاء) ەوە، هەتا سەرەنجام لەگەڵ پۆلێك لە هاوەڵانی بەرەو ناوچە سنوورییەکانی نێوان ئێران و عێراق دەڕۆن و، سەرەتا بنکەو بارەگای هێزی (حەمزة) لە (قەڵاتووکان) دادەمەزرێنن و، دواتریش ماڵەکانیان لەوێ نیشتەجێدەکەن.



لێرەدا بەرلەوەی بچینە نێو باسی قۆناغی ژیانی پێشمەرگایەتیی‌و خەباتی شاخەوە، وا باشە ئاماژە بە شەش خاڵی سەرەکیی لەژیانی ئەو چەند ساڵەی پێشوویدا بکەین:

**یەك:** نیشتەجێبوونی لە گوندی (سەرسیان) بە هاوکاری مامۆستای ئەوسای گوندەکە (مامۆستا مەلا سید عبدالرحمن لۆتەریی) بووەو (حاجی ئاغا) ڕیش سپی گوند "خوا لێی خۆشبێ"و پاش خۆیشی کوڕەکانی: (کاك حسێن و کاك حاجی عەباس) ڕۆڵێکی مەردانەیان بینی لە جێگرتنەوەی بابیانداو، بەپێی توانا بەرگریی لێکردنیدا.

**دوو:** لە گوندی (سەرسیان)و لە کۆتایی ساڵی (١٩٨٤)دا، نۆبەرەو یەکەمین منداڵیان (بەسۆز)ی کچی پەیدابوو، هەروەك یەکەمین کتێبیشی (پوختەیەك دەربارەی ئیسلام) هەر لەو ساڵەدا چاپ کرا، بەسێ هەزار نوسخە.

**سێ:** دووەمین بەرهەمی لە ساڵی (١٩٨٥)دا چاپ کرا کە کتێبی (ئیسلام و ڕێچکان)ەو، ئەو کاتە سەروسەدایەکی گەورەی بووەو لە ماوەیەکی کەمدا نوسخەی لە بازاڕدا نەما، لە حاڵێکدا کە پێنج هەزار (٥٠٠٠) دانەی لێ چاپ کرابوو! چونکە ئەو کتێبە بەرپەرچی مارکسییەکانی دابۆوە، کە ئەو




کاتە بازاڕی مارکسیزم و ماددیگەرایی زۆر گەرم بوو.

**چوار:** نیشتەجێبوونی لە گوندی (گەڵوو) دا بە ئازایەتیی (مامۆسا مەلا سەید سلێمان) و (خاڵ ئەحمەددەرەش)ی (ماخۆبزنان) "خوا لێیان خۆشبێ"و (کاک حاجی حەمە ئاغا) و بە هاوکاریی و ڕێگەپێدانی (کاك عباس بایز باڵو اغا) بوو.

**پێنج:** لە ساڵی (١٩٨٦)دا لە گوندی (گەڵووی ماخۆبزنان) دووەمین منداڵیان (پیرۆزە)ی کچی پەیدابوو، لە ساڵی (١٩٨٧)یشداو، لەکاتێك کە خۆی و خێزانی لە حاڵەتی خۆحەشاردان دابوون، سێیەمین منداڵیان (محمد)ی کوڕی پەیدابوو، کە ئەو کاتە هاوسەری (ڕوخسار خان) لە ماڵی بابی (مامۆستا حەسەن بابەکر) بوو لە گوندی (بۆسکێن).




**شەش:** هەر لەو ساڵەشدا سێیەمین بەرهەمی لە بەغداد چاپکرا، کە کتێبی (یادی خودا)یە، بەسێ هەزار نوسخە.



## ١٤ چوونە چیاو پێشمەرگایەتیی کردن و خەباتی شاخ، دژی ڕژێمی بەعسی فەوتاو



لەماوەی نیشتەجێبوون و مانەوەیدا لە گوندی (قەڵاتووکان)ی بناری قەندیل کە نزیکەی ساڵێکی خایاندوە، وێڕای فەرماندەییتی کردنی هێزی (حەمزە)، چەندان کارو چالاکیی دیکەشی بوون، بۆ نموونە:

**یەك:** ئەندامێتی ئەو شاندەی کە دانوستاندن و ڕێککەوتنی (بزووتنەوەی ئیسلامیی) ئەوسای ئەنجامدا لەگەڵ هەرسێك هێزی سیاسیی سەرەکی ئەوسای سەر گۆڕەپانی کوردستان:



أ- (یەکیەتی ) لە هاوینەهەواری گوێزێ.



ب- (سۆشیالیست) لە گوندی (کاولان).



ج- (پارتی) لە گوندی (ڕاژان) لە ساڵی ١٩٨٧دا.

**دوو:** چەندان جەولەو سەردانی مەیدانی، کە گرنگترینیان ئەو جەولە یەك مانگییەیە کە لە زستانی ساڵی (١٩٨٧) لەگەڵ پۆلێك پێشمەرگەدا کردی و، لە نامیلکەی: (جەولەیەك بە قووڵایی خاکی نیشتیماندا) باسی کراوە، کە کاك (شەریف وەرزێر) و (مامۆستا موحەممەد زەرزی) سازیان کردووە، لەو گەشت و گەڕانەیدا وێڕای چەندان وتارو کۆڕی گشتی، دیدارو گفت و گۆشی لەگەڵ چەند کەسایەتییەکی سیاسیی دیاردا بووە، وەك:




أ- مامۆستا بەهائەددین نووری، کە پێشتر سکرتێری حیزبی شیوعیی بوو.

ب- مامۆستا شێخ عیززەددین حوسەینی، کە ئەو کاتە ڕابەرێکی دیاری کوردستانی ئێران بوو.

جـ- کاك نەوشیروان موستەفا، کە ئەوکاتە سکرتێری کۆمەڵەی ڕەنجدەرانی کوردستان بوو.

د- فوئاد مەعصووم، کە ئەو کاتە ئەندامی مەکتەبی سیاسیی یەکیەتی نیشتیمانی کوردستان بوو و ئێستاش سەرۆك کۆماری عێراقە.




سێ: نووسینی چەند نامیلکەیەك، وەك: (کۆمەڵی خوا)، (پێشمەرگەی ئیسلام) و چەند ئاڵقەیەکی زنجیرەی: (با چاکتر ئیسلام بناسین).

چوار: تۆمارکردن و بڵاوکردنەوەی دەیان کاسێتی تەفسیری قورئان، بەتایبەت ئایەتەکانی لەمەڕ کۆچکردن و جەنگ و جیهاد.

پێنج: فەرماندەییتی جەنگی سەر گردی (ڕەمکان) کە شەهیدکرانی چوار موجاهید و برینداربوونی چەند کەسێکی لێکەوتەوە و، ژمارەیەکی زۆریش سەرباز و جاش کوژران.



## کشانەوەو گواستنەوە بۆ گوندو شارۆچکە سنوورییەکانی کوردستانی ئێران

سەرەنجام و پاش هێرشی زەمینیی و ئاسمانیی توندی ڕژێم، ناچار دەبن سەرەتا ماڵ و خێزانەکانیان و دواتر بنکە و بارەگاکانیشیان هەم لە(قەڵاتووکان) و هەم لە ناوچەکانی دیکەی بناری قەندیلیش "وەك سەرجەم لایەنە سیاسیەکانی



دیکە" چۆڵ بکەن و، لە کۆتایی ساڵی (١٩٨٨)دا ڕووبکەنە شارۆچکە و گوندە سنوورییەکانی کوردستانی ئێران، وەك: کەوپەڕو بادیناواو نەغەدە و سەردەشت و خدراوا، ئیدی بەو جۆرە لەو شوێنانەی ناومان بردن، خۆی و ماڵ و خێزانی و هاوەڵەکانی ژیان بەسەردەبەن، هەتا کاتی ڕاپەڕینی جەماوەریی ساڵی (١٩٩١)، کە سەرەتا ماڵەکەی لە (خدراوا)وە دەگوازێتەوە بۆ ئۆردوگای (دێڵزە) و، پاشان لەساڵی (١٩٩٢)دا ماڵەکەی دێنێتەوە بۆ گوندی (سەرئەشکەوتان)ی نزیك (بێتواتە).





## چەند کارو چالاکییەکی گرنگی ئەو چەند ساڵەی ژیانی ئاوارەیی

لە ماوەی ئەو چوار پێنج ساڵەشدا، (١٩٨٧-١٩٩٢) وێڕای کاروباری ئاسایی حیزب و، سەرپەرشتیی بنکەو بارەگاکان و، بەشداریی ژمارەیەك کۆنگرەو کۆنفرانس و کۆبوونەوەی گرنگ و پڕ گێرەو کێشە، پێویستە ئاماژە بە (دە) (١٠) خاڵی سەرەکیی دیکەش بکرێ:

یـــەك: لە ١٩٨٩/٦/٤دا (عبدالرحمن)ی کوڕی "وەك چوارەمین منداڵ" لە شارۆچکەی سەردەشتەو، پاشان (فاتیمە)ی کچی "وەك پێنجەمین منداڵ" لە ١٩٩٠/١٠/١دا لە گوندی (خدراوا) لەدایك دەبن.




دوو: لە ساڵانی (١٩٨٩-١٩٩١)دا (کۆڕی ڕاوێژی یەکگرتوو) لە ئەندام و کادیرانی چەند هێزێکی نێو بزووتنەوەی ئیسلامیی ئەوساکە پێکدێنێ، بە مەبەستی چاکسازیی تێداکردنی بزووتنەوە.

ســـێ: هەر لەو ساڵانەدا هەرکام لەکتێبی (دەرد و دەرمانی بزووتنەوەی ئیسلامیی) و نامیلکەی (کوردستان بۆ وێران بوو و چۆن ئاوەدان دەبێتەوە؟) و نامیلکەی (حوکمی گەڕانەوە ژێر نیری تاغووت) و نامیلکەی (ڕێبازی پێغەمبەر "صلی الله علیه وسلم" کامەیە؟!) و کتێبی: (ڕێگای صاڵح بوون و بەرەو خواچوون) دەنووسێ.

**چــوار: یەکەمین سەفەری حەجکردنی**

لەسـاڵی (١٩٩١)دا هـاوڕێ لەگـەڵ مامۆستایان: (مەلا مەحموودی ئازادیی) و (مەلا ئەبووبەکری صديقي) داو لە ڕێگای پاکستانەوە، سەفەری حەج دەکات و، دەوری سێ مانگی پێدەچێ و، وەك شاندێکی ڕەسمیی بزووتنەوەش "کە ئەو کاتە ئەندامی مەکتەبی سیاسیی دەبێ" لەگەڵ ژمارەیەك کەسایەتی دیدارو گفت و گۆی دەبێ چ لە سعوودیەو چ لە پاکستانیش، وەك:

١- شێخ (إبن باز)، خوا لێی خۆشبێ.

٢- شێخ (عمر عبدالرحمن)ی میصریی، خوا لێی خۆشبێ.

٣- (برهان الدين رباني).

لە (پیشاوەر)ی پاکستانیش سمینارێك بەزمانی عەرەبی دەبەستێ: لە ڕۆژی: ١٩٩١/٦/١٥دا، لەشاری (پیشاوەر) لەبارەی کێشەی کوردو چۆنیەتی چارەسەرکردنییەوە لە ڕوانگەی ئیسلامەوە، بەناوو نیشانی: (القضية الكوردية: جذورها وكيفية معالجتها)، کە ئەو کاتە لە گۆڤاری (المرابطون)دا بڵاوکراوەتەوە.



## ندوات

# القضية الكردية
# والاحداث الاخيرة في كردستان

### في ندوة للنادي الإعلامي العربي

أقام النادي الاعلامي العربي في باكستان يوم السبت ٣ ذوالحجة الموافق ١٥ / ٦ / ١٩٩١ندوة صحفية في مدينة بيشاور حضرها مندوبون عن المجلات والنشرات العربية التي تصدر في باكستان وعدد من ممثلي المؤسسات الاسلامية العاملة في ساحة الجهاد الافغاني وكانت هذه الندوة بمناسبة زيارة الاخ علي بابير عضو المكتب السياسي للحركة الاسلامية في كردستان العراق لباكستان، قدم للندوة الاخ ابوهلال مدير النادي ورئيس تحرير مجلة المرابطون وتحدث فيها الدكتور عبدالحي سليمان مدير الهلال الاحمر الكويتي ورئيس مجلس التنسيق الاسلامي ، وفيما يلي نص كلمة الاخ علي بابير في الندوة:

أيها الاخوة الاعزاء ، انكم ترحب بكم اصيب ترحيب ونحييكم بتحية الاسلام المباركة فالسلام عليكم ورحمة الله وبركاته ، ونبلغكم سلام وتحيات اخوتكم المجاهدين على أرض كردستان الجريحة تادة وجنودا ، شيوخا وشبابا

ونشكركم كثيراً ونسأل الله الكريم أن يجزيكم أحسن الجزاء لما قمتم به من أجل اقامة هذا الاجتماع الذي يدل على الشعور بالمسؤولية أمام القضية العادلة للشعب الكردي المسلم المظلوم والاهتمام بها .

إخوتي الاحبة :

عنوان البحث الذي اردت تقديمه لكم هو :

ثم اذا كان في الوقت سعة نقف وقفة قصيرة أمام الانتفاضة الاخيرة التي قام بها الشعب الكردي في كردستان العراق

وفي الختام نشير الى مانتظره كشعب مسلم من الاخوة الاسلاميين عموما تجاه قضيتنا المأساوية .

النقطة الاولى : من هو الشعب الكردي ؟

للإجابة على هذا السؤال لا أرى من الضروري أن أدخل بكم في مجاهل التأريخ وأغواره البعيدة ، حيث هناك الكثير من البحوث والدراسات بمختلف اللغات حول اصل الشعب الكردي ونشأته وعاداته وتقاليده ، فمن أراد التعمق والاستقصاء يمكنه الرجوع اليها ولكن

بالاسلام بنسبة ( ٩٨٪ ) وقد قبل الاسلام واعتنقه عن رضا وطواعية في عهد الخليفة الثاني ( عمر بن الخطاب ) رضي الله عنه ، ويحدثنا التأريخ بأنه لم تحدث بين الشعب الكردي والجيش الاسلامي معارك تذكر الا نادراً ، والسبب في ذلك هو ان الشعب الكردي قبل مجئ الاسلام بمدة طويلة لم يكن يجد دولة وكيانا مستقلاً - كما يتوهم ويدعي بعض المتعصبين من الاكراد - بل كان يرزح تحت نير الدولة الساسانية في الشرق والبيزنطية في الغرب اللتين كانتا تذيقانه الامرين . فلما جاء الاسلام بعدله ورحمته وشريعته السمحاء التي لا تفضل عربيا على اعجمي ولا ابيض على ... الاسلام بصورته الاصيلة ... الشعب الكردي واستقبله ... أن الماء البارد في الهجير ، ... من صميم قلبه .

... حول الشعب الكردي في ... له ديناً ومنهج حياة ، فخدمه ... صرة واعلاء رايته بالنفس ... الحضارة الاسلامية مقدماته ... في مجال ... الناحية ... الصلاح الشهرزوري وابن ... الاثير المؤرخ والمحدث - ... خالد النقشبندي وأحمد ... و البيتوشي وامجد



---

وسامي عبدالرحمن ورسول مامند ونوشيروان ، لي الحكومة : لان صدام شخصيا أرسل في طلبي ، فان لم يتيسر لي ، أرسل جلال الطالباني ووفداً معه ، قلت : هل تنتظرون من هذه الحكومة الظالمة خيراً ، قال : لدينا ثلاثة احتمالات ، يجب علينا أن نأخذ باحداها : إما أن نقاوم ، وإما أن نصبر على التشرد والغربة ، وإما أن نتصالح ونتفاوض .. أما المقاومة فكما ترى ، الناس لا يقاومون ، بقي أن نصبر على الهجرة والتشرد وهي صعبة شاقة ، فنحن مضطرون لاختيار الاحتمال الثالث وهو أن نتصالح ونتفاوض ، وقلت له : والله لا أرى في مفاوضتكم هذه خيراً ، قال : لماذا ؟ قلت : لانكم تنطلقون من منطلق ضعيف حيث لا تجدون حلاً سواها ، والامر إذا اختير من منطلق الضعف لا يأتي بخير . الحركة الاسلامية لم تشارك في هذه المفاوضات ، ونحن لا نؤمن بها اصلاً ، وحذرنا منها ، وطريقنا هو الجهاد ، والمضي فيه ، نحن لا نرفض أن نحل مشكلاتنا حلاً سلمياً ، إن رجح لدينا اننا نصل الى حل ، فالله سبحانه وتعالى يقول « وإن جنحوا للسلم فاجنح لها ، وتوكل على الله » أما إذا ايقنا بأن العدو يريد أن يخدعنا ، فلا يلدغ المؤمن من جحر مرتين ، والنظام البعثي خدع هذا الشعب وهذه الاحزاب مرات وليس مرة أو مرتين .

■ ماهو موقف الحركة الاسلامية في كردستان من المخيمات التي يقيمها الامريكان ؟

□ الحركة الاسلامية وكل مسلم عزيز النفس، والله سبحانه وتعالى وصفنا بالعزة ، « ولله العزة ولرسوله وللمؤمنين » يود ألا يضطر الى أن يقبل شيئاً من الاعداء ، بالاخص عدو كامريكا ، حيث ما من مشكلة إلا وجذورها منه ، فلو كان الخيار بايدينا لما قبلنا شيئاً ، ولكن الحالة صعبة ، والناس يتضورون جوعاً ، وامريكا هي التي تقدمت بالمساعدة وتأخر غيرها . فلو كان الشعب الكردي يجد دولاً اسلامية أو جهات اسلامية ، أو اي ملجأ اخر باسم الاسلام لاختاره على امريكا ، فالامر ليس اختياراً بين امريكا وغيرها ، انما هو خيار وحيد .

■ ما دور المسلمين العرب العراقيين في الحركة الاسلامية في كردستان ؟

□ للاخوة العرب والتركمان مشاركة في الحركة الاسلامية ، وفي الانتفاضة الاخيرة ، في كركوك خاصة ، شارك الاخوة العرب والتركمان مشاركة فعالة ، وفتحوا مقرات كثيرة للحركة في كركوك ، ولنا تنظيم من الاخوة العرب، وهناك اخوة ينتسبون الى جماعات اسلامية من الذين نحبهم من اعماق قلوبنا ، ولكنهم يختلفون معنا في بعض الافكار والمواقف ، فنحن نصر على الجهاد ، ونرى اننا لا نصل الى نتيجة بغير القتال والجهاد ، أما هم فلهم طريق اخر ، وبعضهم يقتنعون بما نقول ، ولكنهم ينتظرون الاوامر من بعيد ...

■ هل يسمح لغير الاكراد بالمشاركة في القتال ؟

□ نعم ، لو جاء الاخوة من اي مكان في الدنيا لمساعدتنا نجعلهم على رؤوسنا ، والجهاد الافغاني انما انتصر بحمد الله ، بسبب معاونة المسلمين ..

■ ماهو موقفكم من الحلول الامريكية المطروحة للقضية الكردية ؟

□ نحن لا ننتظر اي خير من امريكا ، فاذا فعلت شيئا انما تفعله من اجل مصالحها ، ولدينا تجربة في تأريخنا الكردي المعاصر ، حيث أن امريكا ساعدت الحركة الكردية من خلال شاه ايران ، لتجعل منها ورقة ضغط على صدام ، فما نؤمن به ونعمل له هو الحل الاسلامي ، الحل الذي ينبثق من شرع الله عزوجل ..

وفي ختام الندوة تحدث الدكتور حمدي مراد الاستاذ في الاكاديمية الاسلامية في بيشاور وكان مما قاله : « .. نود أن نسدي نصيحة اخوية لاخوتنا في هذا الميدان ، وهي : سيروا على بركة الله ، جهاداً في سبيل الله ، احذروا تمييع ساحة الجهاد عندكم ، وحددوا مواقف الولاء والبراء بوضوح ، فانها مدخل الفتنة الكبرى والضياع ، لا سمح الله ، واعلموا أن الله ناصركم بالقلة عدداً وعدة ، إن ثبتم على الحق ، والحق وحده ، انصحكم ، أن تجردوا هذا الجهاد من القومية ، مع انكم ، جزاكم الله خيراً قد اوضحتم طبيعتها .. » ■

### الاخ علي بابير في سطور

■ عضو مجلس شورى الحركة الاسلامية في كردستان العراق ، ومن الاعضاء المؤسسين لها ...

■ تولى قيادة قوات « سيد الشهداء حمزة » التي كان لها تواجد مهم في منطقة رانية و قلعه دزه في محافظة السليمانية حتى توقف الحرب بين العراق وايران .. حيث ساهمت في الدفاع عن هذه المنطقة ضد هجمات القوات البعثية ..

■ يعمل حالياً في عضوية المكتب السياسي للحركة بعد انضمام كتيبة حمزة الى احدى الفرق في التشكيلات الجديدة لقوات الحركة المسلحة ..

■ شارك في احداث الانتفاضة الاخيرة ، وكان له دور كبير في توجيه مجاهدي الحركة ، وتوعية جماهير الشعب الكردي في المدن المحررة ..

■ له العديد من المؤلفات باللغة الكردية ، في مختلف جوانب الفكر الاسلامي ، وخصوصاً ما يتعلق بقضية الشعب الكردي في ضوء الاسلام ..

■ من المواقف المعروفة عن الاخ علي بابير أنه حكم على شقيقه عمر بابير بالاعدام ، وارسل مفرزة من قوات حمزة لتنفيذ هذا الحكم، وتم ذلك في مدينة رانية الحدودية التي كانت تسكن فيها اسرته ، لان شقيقه المذكور وشى باحد افراد الحركة عند مخابرات الدولة ، وكان سبباً في القاء القبض عليه واعدامه .. ■




**پێنـــج:** لەساڵی (١٩٩٢)دا بە چەند وتـار و کۆڕێکی جەماوەریی بەشداریی بانگەشەی هەڵبژاردنەکانی یەکەمین خولی پەرلەمانی هەرێمی کوردستان دەکات و، هەر لەو سەروحەدەشدا کتێبی: (چارەسەری کێشەی کورد لەنێوان ئیمان و پەرلەماندا) دەنووسێ و چاپ دەکرێ.

**شـــەش:** هەروەها هەر لەساڵی (١٩٩٢)دا پاش ئەوەی لە کۆنگرەی بزووتنەوەدا کـە لە گوندی (ســەر ئەشکەوتــان) بەسترا، یەکەمین دەنگ دێنێ، ئەرکی دروستکردنی (مەکتەبی ڕێکخستن) بە ئەستۆوە دەگرێ، کە پێشتر بوونێکی وای نابێ و نامیلکەی: (هەڵوێست و هێڵە گشتییەکانی کارمان لەم قۆناغەدا) دەنووسێ.

**حــەوت:** دووەمین هاوسەرگیریی:

لەکۆتایی ساڵی (١٩٩٢) و لەسەرەتای (١٩٩٣)دا دووەمین هاوسەرگیریی دەکات لەگــەڵ (شــوکریە ئەحمــەد عەبدوڵڵا)دا، هەردووك هاوســەریشی لەخانوویەکدا دەبن لەگوندی سەرئەشکەوتان.

**هــەشت:** لەساڵی (١٩٩٣)دا لەگوندی (سەر ئەشکـەوتان) زنجیرە دەرسی ڕوونکـردنەوەی عەقیدەی طەحاویی، لە (٢٢) ئاڵقەدا دەڵێتەوە، کە دواتر لەســاڵی (٢٠١٥) دا لەدوو تویـی کتێبێکداو بەهەمان ناوونیشان چاپ دەکرێ.




بۆ بینینی سەرجەم دەرسەکان، سەردانی لینکی خوارەوە بکەن:




www.youtube.com/watch?v=TrCrm-MFKFqQ&list=PL6HuvNeXiFwt-5TOZzaAJ4fedU2PmA1t1z

**نـــۆ:** ئنجا دوای ئەوەی لە مانگی ١٢ی ساڵی (١٩٩٣)دا شەڕو گێچەڵ پێکردنی یەکیەتی بە بزووتنەوە ڕوودەدات و، لە ئەنجامدا سەرجەم بنکەو بارەگاکانی بزووتنەوە، پاش بەرگرییەکی قارەمانانە، لەلایەن یەکیەتییەوە دەگیرێن و، ژمارەیەکی زۆریش لە هەردوولا دەکوژرێن و، ئەویش بەشێوەیەکی سەرسوڕهێنەرو بە هاوکاریی چەند براو دۆستێکی دڵسۆز، لەگەڵ سێ پێشمەرگەی دیکەدا دەربازی دەبێت، سەرەنجام دەچێتە ناوچە سنوورییەکانی کوردستانی ئێران و، ژمارەیەکی باش لە هێزی پێشمەرگە لە نزیك (قاسمەڕەش) و (زەڵێ) کۆدەکاتەوە، هاوکات لەگەڵ جەبهەی شارەزوور، ئەویش جەبهەیەکی دیکەی جەنگ دژ بە یەکیەتی لە (پشدەر) دەکاتەوە، پاش چەند مانگێك جەنگ و ڕووبەڕووبوونەوە، لە ئاکامدا یەکیەتی داوای ڕاگرتنی شەڕ دەکات و، مل بۆ داواکارییەکانی بزووتنەوە کەچ دەکات، کە لە گێڕانەوەی بنکە و بارەگاکان و قەرەبووکردنەوەی زیانە ماددییەکاندا خۆی نواندوە.

**دە:** پاش هاتنەوەی بزووتنەوەش بۆ نێو شارو شارۆچکەکانی کوردستان، وەك ئەندامێکی مەکتەبی سیاسیی و بەرپرسی مەکتەبی ڕێکخستن لە کاروباری حیزبیدا بەردەوام دەبێ، هەتا مانگی ٨ی ساڵی (٢٠٠٠)ی زایینی کە یەکەمین کۆنگرەی بزووتنەوەی یەکبوونی ئیسلامیی، لە گوندی (تەوێڵە) ی تێدا بەسترا، کە لە ئاکامی ئەو کۆنگرەیەدا، وەرچەرخان و گۆڕانکارییەکی ڕیشەییی و گرنگ لەژیانی ئەودا بەتایبەتیی و لە بزووتنەوەدا بەگشتی ڕوویدا، وەك دواتر بەکورتیی ئاماژەی پێدەکەین.



## ئاماژە بە (دە) ١٠ لە پێشهات و کاروچالاکییە گرنگەکانی نێوان: (١٩٩٤-٢٠٠٠)

ئێستاش با بەکورتی ئاماژە بە دە (١٠) خاڵی ئەو شەش حەوت ساڵەی تەمەنی بکەین، واتە لەساڵی (١٩٩٤)ەوە تاکو (٢٠٠٠):

**یـــەك:** سەرەتای ساڵی (١٩٩٤)دا دوای ئەوەی خۆی دەچێتە ناوچە سنوورییەکان و سەرگەرمی کۆکردنەوەو ڕێکخستنەوەی هێزەکانیان دەبێ، ماوەی چەند مانگێك هەردوو هاوسەری (روخسار خان وشوکریە خان) بەخۆحەشاردان دەیگوزەرێنن و، پاشان ماڵەکەی دەباتە (نەغەدە) و دواتریش دەیگوازێتەوە بۆ (مەریوان) و لە ساڵی (١٩٩٥) و (١٩٩٦)دا ماڵی هاوسەرێکی (شوکریەخان) لە (ئەحمەد ئاوا)و، ماڵی یەکیشیان (ڕوخسارخان) لە (مەریوان) دەبێ.

**دوو:** لە ڕۆژی: ١٩٩٤/١/١دا (شادی) کوڕی "وەك شەشەمین منداڵ" لە هاوسەری یەکەمی و، لە (٤/٢٤)ی هەمان ساڵیشدا (یسری)ی کچی "نۆبەرەی هاوسەری دووەم و حەوتەمین منداڵ" لەدایك دەبن، هەروەها هەرکام لە (مەلا شەریف)ی کوڕی لە (١٩٩٥/١٠/٢٥)و، (شوان) لە (١٩٩٧/٨/١)و، (ئەحمەد) لە (١٩٩٩/٦/١) یەکەمیان لە ئەحمەدئاواو، دووەمیان لە هەولێر و، سێیەمیان لە هەڵەبجە، لە هاوسەری دووەمی لەدایك دەبن، کە هەشتەم و نۆیەم و دەیەم منداڵن.

**ســـێ:** کردنەوەی چەند خولێکی جۆراو جۆر:

لەماوەی ئەو ساڵانەدا وێڕای سەردانو جووڵەی زۆر بۆ گەلێك شارو شارۆچکەو دێیەکانی کوردستان، چەند خول (دورة)ێکی عەقیدەیی و فیکریی و سیاسیی بۆ ئەندام و پێشمەرگەکانی (بزووتنەوە) دەکاتەوە، کە یەکێك لەو دەورانە، ئەو دەوردیە

دەبێ کە لە شارۆچکەی هەڵەبجە لە مزگەوتێك دەیکاتەوە و لە دووتوێی پەنجا دەرسدا باسی (ئیمان و عەقیدەی ئیسلامیی) دەکات، کە دواتر باسی دەکەین.

هەروەها هەر لەو ساڵانەدا چەند وتارێکی جومعە لە مزگەوتی (جیهاد) لە سلێمانی دەدا، کە وێڕای بڵاوبوونەوەیان بە کاسێتو سیدیی، هەندێکیان پاش نووسرانەوە، دەکرێنە کتێب و نامیلکەش و چاپ و بڵاودەکرێنەوە.

چــوار: نووسینی چەند کتێب و نامیلکەیەك:

هەروەهـــا هەر لەو ســاڵانەدا چـــەند کتێب و نـامیلکەیەکیش دەنووســـێ و چاپ و بڵاودەکرێنـــەوە، وەك: (بزووتنـــەوەی ئیسلامیی لە دووڕییانی مان و نەماندا)، (بزووتنەوەی ئیسلامـــیی و ئاسـۆیەکی گەشو ڕوون)، (پڕۆژەی بەرنـــامەی فیکریی کاری ئیسلامیی)، (مســـوڵمانی کامـــڵ، بەشـــی یەکەم: بیـــروبڕوای مسوڵمان)، (مسوڵمانی کامـــڵ، بەشی دووەم: خواپەرستیی مسوڵمان)، (چەند ڕێنماییەك بـــۆ ئیســـــلامـــییەکانی کوردستان)، (ئیسلام و کێشە هەنووکەییەکان)، (زانایانی ئیسلام کێنو چۆنن؟).















پێنج: سەفەرێك بۆ تورکیا و پێنج وڵاتی عەرەبیی:

لەساڵی (١٩٩٦)دا هاوڕێ لەگەڵ (مامۆستا حەسەن بابەکر و کاك حاجی دڵشاد کەلاریی و مامۆستا موحەممەد سەنگاویی "خوا لێی خۆشبێ") سەفەری تورکیا دەکات و، وێڕای بەشداریی لەو کۆبوونەوەیە ساڵانەیەدا، کە حیزبی (ڕەفاه) بەبۆنەی یادکردنەوەی فەتحی شاری (قسطنطينية) لە لایەن سوڵتان (محمد فاتح)ەوە، سازی دەکات، هاوڕێ لەگەڵ مامۆستا حەسەن بابەکردا،



سەردانی سوریا و لوبنان و ئوردون و سودان و یەمەن دەکات و، چاوی بە چەندان لایەن و کەسایەتی ئیسلامیی دەکەوێ و، قسەو باسیان لەگەڵ دەکات و باسی واقیعی هەرێمی کوردستان و حاڵەت و تەوژمی ئیسلامییان بۆ دەکات، لەوانە:

١- چەند کەسایەتییەکی مسوڵمانی کوردستانی تورکیا و هەندێك لە وڵاتانی دیکە.



٢- (شێخ عوسمانی بیارەیی) "خوالێی خۆشبێ" کە پێشتریش لە ساڵی (١٩٨٤) دا لە بەغداد بینیبووی.

٣- هەرکام لە مامۆستا (مەلا عثمان عبدالعزیز) ڕابەری ئەوسای بزووتنەوەی ئیسلامی و مامۆستا (صلاح الدين محمد بهاءالدين) ئەمینداری گشتی یەکگرتووی ئیسلامی، کە هەردووکیان بانگهێشتی بۆنەی (فتح القسطنطينية) کرابوون.



٤- (الأستاذ فتحي يكن) ئەميرى (الجماعة الإسلامية)ى ئەوساى لوبنان.



٥- (سيد محمد حسين فضل الله) كەسايەتى ناودارى شيعة، لە لوبنان.




٦- الشيخ أحمد كفتارو، موفتى ئەوساى سوريا.

٧- الاستاذ عبدالمجيد ذنيبات، (المراقب العام)ى ئەوساى (إخوان المسلمين) لە ئوردون.

٨- دکتۆر محمد شەریف، لە ئوردن.




٩- الدكتور عبدالكريم زيدان، لە يەمەن.

١٠- (الأستاذ محمد يدومي) بەپرسێکی ئەوسای (التجمع اليمني للإصلاح) لە يەمەن.

١١- دکتۆر نظام الدين عبدالحميد برای دکتۆر محسن عبدالحميد، کە ئەوکاتە لەسوودان بوو.

شایانی باسە ئەو سەفەرەی نزیکەی سێ مانگی پێچووە.

**شـــەش: کۆچی دوایی کردنی هاوسەری یەکەمی:**

هەروەها لە ١٩٩٦/١١/٥دا، هاوسەری یەکەمی (ڕوخسار إبراهیم) لە یەکێك لە خەستەخانەکانی (تاران)دا کۆچی دوایی دەکاتو، خەم و خەفەت و پەژارەیەکی یەکجار زۆر دەچێژێ، کە ڕەنگە لەوەوپێش خەمو پەژارەی وای نەدیبێ.

مەڕاسیمی بەخاك سپاردنەکە لەو لینکەی خوارەوەدایە:



https://youtu.be/eOijICg1ZW4?t=2

حــەوت: دووەمین سەفەری حەج:

لە ساڵی (١٩٩٧)دا بۆ جاری دووەم سەفەری حەج دەکات، بەنیەتی ئەوە کە حەج و عومرە بۆ هاوسەری کۆچکردووی بکات، لەسەر وەسیەتی خۆی.

هەشــت: سەفەرێك بۆ لیبیا

لەساڵی (١٩٩٨)دا هاوڕێ لەگەڵ ڕابەری گشتی ئەوسای بزووتنەوەی ئیسلامیی (مامۆستا مەلا عەلی عەبدولعەزیز) کە پاش بەستنی کۆنگرە هاتە شوێنی (مامۆستا مەلا عوسمان)ی برای "خوا لێیان خۆشبێ"و وە چەند ئەندامێکی دیکەی بزووتنەوە، سەرەتا سەفەری (سوریا) و، پاشان (لیبیا) دەکات لەڕێی دەریاوەو بەتێپەڕبوون بە دورگەی (مالتا)دا، بە مەبەستی وەڵامدانەوەی بانگهێشتی حکومەتی (لیبیا)و، بەشداریی کردن لە کۆبوونەوەکی گشتیدا، کە بۆ لایەن و ڕێکخراو و تەوژم و کەسایەتییە ئیسلامییەکان سازکرابوو لەسەر ئاستی زۆربەی وڵاتانی ئیسلامیی، بەڵام لەگەڵ شاندەکەدا ناچێ بۆ دیتنی (معمر قذافي) و حەز بەچارەی ناکا.





نـــۆ: پەیدابوونی بزووتنەوەی یەکبوونی ئیسلامیی:

لە ساڵی (١٩٩٩)دا "کە ئەوکاتە ماڵی لە هەڵەبجە دەبێ" هەردوو (بزووتنەوەی ئیسلامیی) بە ڕابەرایەتیی مامۆستا مەلا عەلی عەبدولعەزیز و (بزووتنەوەی ڕاپەڕینی ئیسلامیی) بە ڕابەرایەتی مامۆستا صدیقی برای (بزووتنەوەی یەکبوونی ئیسلامیی) ڕادەگەیەنرێ‌و، بڕیاریش دەدرێ کە پاش ساڵێك لەو کاتەوە، کۆنگرەی یەکەمی (بزووتنەوەی یەکبوونی ئیسلامیی) ببەسترێ.

دە: پەنجا دەرس لەبارەی ئیمان و عەقیدەی ئیسلامییەوە:

لە ٤/صفر/١٤٢١ك تاکو ٦/ربیع الأول/١٤٢١ك، بەرانبەر: (١/٥/٢٠٠٠)ز تاکو (٨/٦/٢٠٠٠)ز پەنجا (٥٠) وانەی لەژێر ناوونیشانی: (ئیمان و عەقیدەی ئیسلامیی لەبەر ڕۆشنایی قورئان و سوننەتدا) لەمزگەوتی شەهیدان لەشاری هەڵەبجەدا پێشکەش کرد، کە دوایی کاك مەلا بیلال قەڵادزەیی نووسینیەوەو خۆشی بەوردیی پێیـــاندا چـــۆوەو، بوونە مەوسووعەیەکی شەش بەرگیی و چاپ کران.



لینکی سەرجەم دەرسەکانی (ئیمانو عەقیدەی ئیسلامیی) لە یوتیوب:




www.youtube.com/watch?v=1OnOx9zSu-o&list=PL6Hu-vNeXiFwvVnyVRsbqXg_2HUd3RNm9P



## ١٨ کۆچی دوایی دایکی

لە (٢٠٠١/٢/١٨)دا دایکی لە خەستەخانەیەکی شاری سلێمانییدا کۆچی دوایی دەکات و لەگۆڕستانی خوڕماڵ بەخاك دەسپێرری، "خوا لێی خۆشبێ و جێگای بەهەشت بێ".





## ڕاگەیاندنی دامەزراندنی کۆمەڵی ئیسلامیی کوردستان، لە (٢٠٠١/٥/٣١)دا

پاشان دوای ئەوەی لە مانگی (٨)ی ساڵی (٢٠٠٠)دا کۆنگرە دەبەستریَ و، هەرچەندە پێشتر هەموولایەك بڕیاری پابەندییان داوە بە ئەنجامەکانی کۆنگرەوە، لیژنەی باڵای ئامادەکارییش یەکدەنگ ڕایدەگەیەنن کە کۆنگرە بە سەرکەوتوویی کۆتایی بە کارەکانی هێناوە، بەڵام کۆمەڵێك کەس بە دەرەنجامەکانی کۆنگرەوە پابەند نابن.

بەڵێ دوای ئەوە کێشەو گرفتی گەورە لەنێو بزووتنەوەکەدا پەیدادەبیَو، هەرچەندە خۆی و هاوەڵەکانی لە کۆنگرەدا سەرکەوتنیان بەدەستهێناوە، بۆ ماوەی زیاتر لە نۆ مانگ هەوڵدەدەن و ئارام دەگرن و تەنازولی زۆر دەکەن، بەڵام تەرەفی بەرامبەر هەر ڕازی نابیَو، سەرەنجام بە ناچارییو بۆ دەربازکردنی بزووتنەوەکە لەو قەیرانە کە تێی کەوتوە، کۆمەڵێك گرفت و کێشەو دەردی دیکەش، لە ڕۆژی: (٢٠٠١/٥/٣١)دا خۆیان کە زۆربەی هەرزۆری سەرکردایەتی تازەو پێشمەرگەو ئەندام و کادیرانی بزووتنەوەکە دەبن، بە ناوی: (کۆمەڵی ئیسلامیی لە کوردستانی عێراق) و وەك درێژەپێدەری کارو خەباتی بزووتنەوە پێشووەکان ڕادەگەیەنن و، ئەویش بە کۆی دەنگی سەرکردایەتی تازەی دەرچووی کۆنگرە، پاش داواو داکۆکیی زۆریان، بە ئەمیری کۆمەڵی ئیسلامیی هەڵدەبژێرریَو بەیعەتی پێدەدریَ.




**لێرەشدا ئاماژەدان بەچوار مەسەلە، پێویستە:**

**یەك:** بەر لەوەی کۆمەڵی ئیسلامیی ڕابگەیەنرێ، نامیلکەیەکی (٢٥) بڕگەیی دەنووسێ بەناوونیشانی: (بنەما شەرعییەکان و هێڵە گشتییەکانی کۆمەڵێکی ئیسلامیی ڕەسەن) و لەگەڵ ئەندامانی سەرکردایەتیدا دەیخاتە ڕوو و تاووتوێی دەکەن، ئەو بیستو پێنج خاڵە دەکرێتە بناغەی بەرنامەی فیکریی و سیاسەتی شەرعیی کۆمەڵ.

**دوو:** پێش ڕاگەیاندنی کۆمەڵی ئیسلامییو، دوای بە بنبەست گەیشتنی وەزعی بزووتنەوەی یەکبوون، دەچێتە ماڵی هەرکام لە: (مامۆستا صدیق عەبدولعەزیز) و (مامۆستا شێخ موحەممەد بەرزنجیی) "خوا لێی خۆشبێ"و (مامۆستا ئەحمەد کاکە مەحموود) "خوا لێی خۆشبێ"و بەنۆرەو بە جیاجیا داوا لەهەرسێکیان دەکات، کە ڕابەرایەتی ئەو گۆڕانکارییە بکەن، کە خۆی فەرز کردوەو، ئامادەیی بەیعەت پێدان و پشتگیریی کردنی تەواوی خۆیشی و، ئەوانەش کە بە قسەی دەکەن، بۆیان دەربڕێ، بەڵام هیچ کامیان ئامادە نابن بێنەپێش!

**سێ:** پاش ڕاگەیەنرانی کۆمەڵو کۆنترۆڵکرانی زۆربەی هەرەزۆری بنکە و بارەگایەکان بەبێ نواندنی توندو تیژیی، تەرەفی بەرامبەر دەکەوێتە حاڵەتی ڕووبەڕوو بوونەوە و پەلاماردان و تەق و تۆق و بۆسەدانان و...هتد.

بەڵام بەهۆی دووربینیی و دانبەخۆداگرتن و بیستن و گوێڕایەڵیی (السمع و الطاعة)ی تەواوی ئەندام و پێشمەرگەکانەوە، بۆ قیادە و ڕێڕوونییەکانی، بارودۆخەکە لە تێکچوون و شڵەژان و کوشتار دەپارێزرێ.

**چوار:** ئیدی سەرەنجام (کۆمەڵی ئیسلامیی) وەك ئەمری واقیع خۆی لەسەر ساحەکە دادەکوتێ و، هێدی هێدیش لەلایەن لایەنە سیاسیەکانەوە مامەڵەی لەگەڵ دەکرێ.




## چاوپێکەوتنێکی ڕۆژنامەوانیی گشتگیر بەزمانی کوردیی

لەڕۆژی (٢٠٠٢/١٠/٦)دا د. حسین محمد عزیز چاوپێکەوتنێکی چەند ئاڵقەیی لەگەڵدا ئەنجام دەدا، کە دوایی لەدوو توێی کتێبێکدا بەناوی: (سنوورە قەدەغەکان مەشکێنن)دا چاپ دەکرێ.

سنوورە قەدەغەکان مەشکێنن!

دەقی چاوپێکەوتن و دەمەتەقێیەک، لەگەڵ میری (کۆمەڵی ئیسلامیی لە کوردستان / عێراق عەلی باپیر)

حوسێن محەمەد عەزیز

2003/2703ک ز

لەم چاوپێکەوتنەدا، گەلێ زانیاریی ورد و گرنگ، دەربارەی کێشە و گرفتەکانی (( ئایین بە گشتیی و ئایینی ئیسلام بە تایبەتیی، مێژووی بزووتنەوەی ئیسلامیی ڕامیاریی لە کوردستاندا، خەباتی چەکداریی و "جیهاد"، ڕێکخراوەکانی (یەکگرتوو، بزووتنەوە، جوند ـ ئەنسار ئەلئیسلام)، ناسیونالیزم، کۆمـــــونیزم، دیکتاتۆریی، دیموکراسیی، جیهانگیریی، ســــیکولاریزم، پلـــورالیزم، تیرۆر، جـەنگی ئیوخۆ، پێوەندییەکانی "کـۆمەڵی ئیسلامیی" لەگەڵ ڕێکخراوەکانی دیکەی کوردستان و ناوچەکەدا.....)) دەخوێننەوە.

DO NOT BREAK THE FORBIDDEN BORDERS

Dr. HUSSEIN M. AZIZ

2003/2703k



## لەدایك بوونی منداڵی یازدەیەمینیان (شیفا)

لە ٢٠٠٢/١٠/٢٥دا (شیفا)ی کچی لەدایك دەبێ، لە گوندی ئەحمەداوا، کە یازدەمین منداڵیانە.



## بانگهێشتێك لەلایەن حکوومەتی سعوودیەوە

لە ساڵی (٢٠٠٢)دا لەگەڵ شاندێك بۆ عومرە کردن لەلایەن حکوومەتی سعوودییەوە بانگهێشت دەکرێ و نزیکەی حە فتەیەکیان پێدەچێ، هاوەڵەکانیشی:

١- مامۆستا عبدالله قەصرێ، "خوا لێی خۆشبێ". ٢- کاك ئارام قادر. ٣-مامۆستا دارا محمد أمین، دەبن، ئەندامانی قیادەی کۆمەڵی ئیسلامیی لەوکاتەدا.





## مووشەکبارانکرانی بنکەو بارەگاکانی کۆمەڵی ئیسلامیی لەلایەن ئەمەریکاوە

لە شەوی: ٢٠ /٢١ی ٣ی (٢٠٠٣)دا بنکەو بارەگاکانی کۆمەڵ لە شارەزوورو هەورامان لەلایەن ئەمریکاوە مووشەکباران دەکرێن و، لە ئاکامدا دەوری (١٠٠) کەسێکیان لە ئەندام و کادیر و پێشمەرگە لێ شەهیدو بریندار دەبن و، سەرەنجام بەپێی ڕێککەوتنێك لەگەڵ یەکیەتیدا، بنکەو بارەگاکانیان دەگوازنەوە بۆ ناوچەی پشدەرو، خۆیشی بەماڵ و خێزانەوە لە گوندی (دارەشمانە) نیشتەجێدەبێ، تاکو لەنزیکەوە سەرپەرشتی هێزەکان و بنکە و بارەگاکانیان بکات.

لینکی ساروخ بارانەکە لە یویتیوب:




https://youtu.be/L4ggnIY-6Hg?t=1



## دەستگیرکرانی لەلایەن هێزەکانی ئەمەریکاوە

لە ڕۆژی ٢٠٠٣/٧/١٠داو لەکاتێکدا کە بەرێوەدەبن بۆ دیدار لەگەڵ چەند بەرپرسێکی ئەمریکاییدا لە هوتێل عەشتار، لە ڕێی دووکان لە نزیك گوندی قەمچووغە دەکەوێتە بۆسەی ئەمریکاییەکانەوە و، خۆیو سێ ئەندامی سەرکردایەتیی کە بەرێزان: (دارا محمد أمین، توفیق کریم، عبدالرحمن سان) بوون، وێڕای (١٠) کەسی دیکە لە حیمایەو شۆفێر و (إبراهیم)ی برای، دەستگیر دەکرێن و، بە سێ کۆپتەر سەرەتا بۆ موصڵو، پاشان بۆ فرۆکەخانەی بەغداد دەبرێن.



## بیست و دوو مانگ مانەوە لەزیندانی ئەمەریکادا

ئیدی سەرەنجام خۆی (٢٢) مانگ و، هاوەڵەکانیشی لەچەند ڕۆژ و چەند هەفتەیەکەوە هەتا یازدە (١١) مانگ لە زینداندا دەمێننەوە، شایانی باسە (إبراهیم باپیر)ی برای، پاش سەرجەم هاوەڵەکانی و دوای یازدە مانگ بەردەدرێ.

ئنجا لە سۆنگەی ئەوەوە کە لە کتێبی (ئەشکەنجەو زیندان)دا بەدرێژیی باسی سەرگوزشتەی ئەو گیران و زیندانیی کرانەی کردوە، لێرەدا بە پێویست نازانرێ کە قسەی زیاتری لەسەر بکرێ.

بەڵام ئەوەی کە لێرەدا پێویستە ئاماژەی پێ بدرێ، ئەو کتێبەیە کە لە زیندانی (کرۆپەر)ی ئەمریکادا نووسیویەتی لەبەر ڕۆشنایی قورئاندا، کە تاکە سەرچاوەی بەردەستی بووە، ئەویش کتێبی: (الإسلام كما يتجلى في كتاب الله) یەو، کە لە هەشت بەرگ و (٣٤٢٠) لاپەڕەدا چاپ کراوە و، ئێستاش لەشێوەی مەوسووعەیەکی دوازدە کتێبیدا چاپی دووەمی دەکرێتەوە.



## ڕێپێوان وخۆپیشاندانی جەماوەریی بۆ بەردرانی لەزیندان، لە نیزیك شاری هەولێر

لە: (٢٠٠٣/٧/٢١)دا دوای یازدە ڕۆژ لەدەستگیرکرانی، لەشاری هەولێر خۆپیشاندانێکی جەماوەریی بەرفراوان سازکرا لەبەردەم هوتێل خانزاد، کە بەرپرسانی هاوپەیمانان لەوێ بوون، شایانی باسە ژمارەیەکی زۆر لەمامۆستایانی



ئایینی هەولێرو دەوروبەری و، بەشێك لەزانایانی (موصلّ)یش بەشدار دەبن و، لەڕیزی پێشەوەی خۆپێشاندانەکە دەبن، لەنێویشیاندا: (شێخ إبراهیم النعمة).





بۆ بینینی خۆپیشاندانەکە، سەردانی لینکی خوارەوە بکەن:




https://youtu.be/ie_Dekk3AM4?t=619



## ڕێپێوان و خۆپیشاندانی جەماوەریی بۆ ڕزگارکردنی لەزیندان، لەشاری سلێمانیی

لە: (٢٠٠٣/٨/٢)دا دوای ٣١ ڕۆژ لەدەستگیرکرانی لەشاری سلێمانیی، ڕێپێوان و خۆپیشاندانێکی جەماوەریی بەرفراوان سازکرا، بەبەشداریی زانایان و سەرجەم چین و توێژەکانی خەڵك، کە هەزاران کەس بوون.









بۆ بینینی خۆپیشاندانەکە، سەردانی لینکی خوارەوە بکەن:



https://youtu.be/BGykyYhXSAk?t=666



## خۆپێشاندان لەبەردەم باڵیۆزخانەی ئەمەریکا لە (لەندەن)

لەڕۆژی پێنجشەممە: ٢٠٠٣/٨/٧دا، لەبەردەم باڵیۆزخانەی ئەمەریکا لەنێوەڕاستی (لەندەن)ی پایتەختی بەریتانیادا، ژمارەیەکی بەرفراوان لەپەنابەری کورد خۆپێشاندانیان ئەنجامدا، کە تێیدا داوای ڕزگارکردنی مامۆستایان دەکرد لەزیندانی ئەمەریکا.





## کۆنگرەی پشتگیریی لەئازادکردنی مامۆستا لە شاری سلێمانیی

لەژێر دروشمی: (هەموومان پشتگیری ئازادکردنی مامۆستا عەلی باپیرین) ڕۆژی دووشەممە: ٢٠٠٤/٧/١٢ لە هۆڵی (ئۆسکار) لەشاری سلێمانیی، بەئامادەبوونی مامۆستا شێخ موحەممەد بەرزنجیی پێشەوای کۆمەڵی ئیسلامیی و نوێنەرانی حیزب و لایەنە کوردستانیی و عێراقییەکان و، دەزگا حکوومیی و حیزبیی و پیاو ماقووڵان و نووسەران و ڕۆشنبیران و یاساناسان و ڕۆژنامەنووسان، کۆنگرەی پشتگیریی لە ئازاکردنی مامۆستا سازکرا.





تەواوی کۆنگرەکە، لە لینکی خوارەوەدایە:



https://youtu.be/R4443Fx9viM



## ٣٠ بەستنی دوو کۆنگرەی دیکەی پشتگیریی لەبەردانی لەهەردووك شاری: (هەولێر) و (کەرکووك)

هەروەها بەهەمان شێوە لەهەرکام لەشارەکانی: (هەولێر) و (کەرکووك)یش کۆنگرەیەکی پشتیوانی لە ئازادکردنی سازکرا، بەئامادەبوونی مامۆستا (شێخ موحەممەد بەرزنجیی) پێشەوای کۆمەڵی ئیسلامیی، لەڕۆژانی: (٢٠٠٤/٧/١٠) و (٢٠٠٤/٧/١١).



دیمەنێك لە كۆڕی وشارخوێندنەوە - هەولێر






## دەربازبوون لە زیندانی ئەمەریکا

پاش گوزەراندنی (٦٥٩) ڕۆژ، سەرەنجام ڕۆژی پێنج شەممە ٢٠٠٥/٤/٢٨ خوا رزگاری دەکات و سەرەتا لە نزیك چیمەنی لای کەرکوك جەماوەرێکی چەند هەزار کەسی پێشوازیی لێ دەکەن، پاشان لە هەرکام لە دەشتی هەڵەبجەو، دەشتی بیتوێن و، گوندی هەنارەی نزیك هەولێر، لەلایەن خەڵك و جەماوەر و ئەندام و دۆست و لایەنگرانی کۆمەڵی ئیسلامیی: هەڵەبجەو هەورامان و شارەزوور و، پشدەر و بیتوێن و، هەولێرەوە، پێشوازیی لێدەکرێ.




لینکی پێشوازییە جەماوەرییەکە لەیوتیوب:



https://youtu.be/onYEplxkil8?t=1938




دیارە ڕزگاربوونەکەشی پاش فەزڵ و بەخششی خوا "عز وجل" بەرهەمی هەوڵ و هیممەتی قیادە و ئەندام و دۆست و لایەنگرانی کۆمەڵ و جەماوەری مسوڵمانی کوردستان و، گەلێك لایەن و کەسایەتیی و چین و توێژی جۆراوجۆر بوو بەتایبەت: بەڕێزان مام جەلال سەرۆك کۆمار و، کاك مەسعوود بارزانی سەرۆکی هەرێم، چەندان کەسی دیکە، کە لە کتێبی (ئەشکەنجەو زیندان)دا بەوردی باسکراون.





## ٣٢ چاوپێکەوتنێکی نۆ ئاڵقەیی لەبارەی زیندانی ئەمەریکاوە

پاش گەڕانەوەی لەزیندان، لەڕۆژانی: (٢٠٠٥/٦/١٣) تاکو (٢٠٠٥/٧/١٠) دا چاوپێکەوتنێکی ڕۆژنامەوانیی لەلایەن کاك (هاوژین عمر)ەوە لەگەڵدا دەکرێ، لەبارەی سەرگوزشتەی گیرانی لەلایەن ئەمریکاوە، کە دوایی کرا بە کتێب بەناوی (ئەشکەنجەو زیندان)و بۆ زمانەکانی عەرەبیی و فارسیی و ئینگلیزییش وەرگێڕدراوە، بەڵام تەرجەمە ئینگلیزییەکەی ئێستا لەژێرچاپە.



سەرجەم دیدارەکە لە یویتیوب هەیە:



https://www.youtube.com/playlist?list=PL6HuvNeXiF-ws6CQrQuL-Rc7v6feyM7Hvv



## ٣٣ کردنـەوەی خـولێك

لە: ٦/٨/٢٠٠٥ تاکو ٨/٨/٢٠٠٥دا خولێکی لەمەڵبەندی هەولێر کردەوە بەناوونیشانی: (ئیسلام و مسوڵمانەتیی لەبەر ڕۆشنایی قوڕئان و سوننەتدا) کە شەش دەرس بوو، دوایی سێ وتاری دیکەیان خرانە پاڵ و هەموویان لەدوو توێی کتێبی: (ئیسلام و مسوڵمانەتیی لەبەر ڕۆشنایی قورئان و سوننەتدا) لەساڵی ٢٠٠٦دا چاپ کران.



لینکی خولەکە لە یوتیوب:




https://www.youtube.com/playlist?list=PL6HuvNeXiFwt_N653HIcveb_2vwLWOCCq




## یەکەمین کۆنگرەی کۆمەڵی ئیسلامیی و هەڵبژێررانەوەی بە ئەمیر

لە ٢٠٠٥/١١/١٢ داو لە یەکەمین کۆنگرەی کۆمەڵی ئیسلامییدا بەیەکدەنگیی ئەندامانی کۆنگرە بە ئەمیری کۆمەڵ هەڵبژێردرایەوە.




لینکی کۆنگرەکە لە یوتیوب:




https://youtu.be/GtUfz9tXTpc



## ٣٥ بەشداریی کردن لە خۆپیشاندانی جەماوەریی لەشاری هەولێر، دژی بێڕێزیی کردن بە پێغەمبەری خوا "صلى الله عليه وسلم"

لەشاری هەولێر بۆ بەرگریی کردن لە پێغەمبەری خوا "صلى الله عليه وسلم" لە (٢٠٠٦/٢/١٤)دا بەشداریی کرد لەوخۆپیشاندانە جەماوەرییە فراوانەدا، کە لەدژی سووکایەتیی و بێ ڕێزیی نواندن بەرانبەر بە پێغەمبەر "صلى الله عليه وسلم" ئەنجامدراو، وتارێکی کورت و پوختی پێشکەشی ئاپۆرای چەند هەزار کەسیی کرد، شایانی باسە مۆڵەتی خۆپیشاندانەکەش لەلایەن کۆمەڵی ئیسلامییەوە وەرگیرابوو.



بۆ بینینی وتارەکەی سەردانی لینکی خوارەوە بکەن:




https://youtu.be/FnK9Bb_OvFs?t=1313




## یەکەمین چاوپێکەوتن لەگەڵ کەناڵێکی عەرەبییدا پاش ڕزگاربوون لەزیندانی ئەمەریکا

لەڕۆژی: ٢٠٠٦/٢/٢٤ لە عەممانی پایتەختی ئوردن، چاوپێکەوتنێکی لەگەڵ کەناڵی: (العربیة)دا ئەنجامدا، کە لەلایەن پێشکەشکار (سعد السیلاوي) یەوە ئەنجامدرا.

دواتریش ئەو چاوپێکەوتنە لەدوو توێی نامیلەیەکدا چاپ کرا بەناو و نیشانی: (ضیف و حوار).




بۆ بینینی بەرنامەکە سەردانی لینکی خوارەوە بکەن:




https://youtu.be/VULqD_fZZwE?t=1

## ٣٧ لەدایك بوونی منداڵی دوازدەیەم و سێزدەیەمیان (شایان و شاکار)

لە (٢٠٠٦/٦/٢٦)دا لەشاری هەولێر دووانەیەکی کوڕ و کچیان دەبێ و، ناویان دەنێن (شاکارو شایان)، کە منداڵی دوازدەیەم و سێزدەیەمیانن.

## ٣٨ دووەمین چاوپێکەوتنی لەگەڵ کەناڵێکی عەرەبییدا پاش هاتنەوەی لەزیندانی ئەمەریکا

لەڕۆژی ٢٠٠٦/٧/٦دا چاوپێکەوتنێکی دیکەی لەگەڵ کەناڵی (العالم) بەرنامەی: (لقاء خاص) ئەنجامدا لەشاری هەولێر لەلایەن پێشکەشکار (أیوب رضا)وە، کە نێوەڕۆکی لە چاوپێکەوتنەکەی کەناڵی (العربیة)وە نیزیك بوو.

دواتریش ئەو چاوپێکەوتنە لەدوو توێی نامیلکەیەکدا چاپ و بڵاوکرایەوە، بەهەمان ناوونیشان.

بۆ بینینی بەرنامەکە سەردانی لینکی خوارەوە بکەن:



https://youtu.be/fYt6wkgnreM?t=2



## سەفەرێك بۆ بەریتانیا

لە: ٢٠٠٦/٨/٥دا بە هاوەڵیی كاك (محمد حكيم) و كاك (طه ظاهر) سەفەرێكی یەك مانگیی بۆ بەریتانیا دەكات و، چەندان كۆڕو سمینار لە شارەكانی ئەو وڵاتەدا بۆ كوردەكان دەبەستێ و، كە یەكیان لە لەندەن لە هۆڵی (KCC)دا دەبێ بە ناوونیشانی: (ڕەوەندی كورد لە هەندەران و ئەركەكانی ) دا، لەڕۆژی: ٢٠٠٦/٩/٢دا، كە دواتر وێڕای وتارێكی دیكەی لەنامیلكەی: (ڕەوەندی كورد لە هەندەران و ئەركی سەرشانی )دا بڵاوكراونەوە.

هەروەها كۆمەڵێك دیدارو گفت و گۆی وێڕای وەزارەتی دەرەوەی بەریتانیا، لەگەڵ ژمارەیەك كەسایەتی ئیسلامییدا دەبێ، بۆ وێنە:



١- (الشيخ راشد الغنوشي أمين عام حركة النهضة التونسية).

٢- (الأستاذ علي البيانوني، المراقب العام للإخوان المسلمين في سوريا).

٣- ( د. كمال الهلباوي).



بۆ بینینی وتارەکان سەردانی لینکی خوارەوە بکەن:




https://www.youtube.com/playlist?list=PL6HuvNeXiF-wsQ0vmDKol9m9oasmBD67gx




## بەشداریی لە کۆبوونەوەی مەککە (إجتماع مكة)دا

ڕاستەوخۆ پاش گەڕانەوەی لەو سەفەرە و لە ٢٠٠٦/١٠/٢٠و لە مانگی ڕەمەزاندا، لەڕێی بەغداد و عەممانەوە، بە بانگهێشتی ڕێکخراوی کۆنگرەی ئیسلامیی (منظمة المؤتمر الإسلامي) لە شاری مەککەی بەڕێز و لە شەوی (٢٧)ی ڕەمەزاندا، بەشداری کۆبوونەوەی مەککە (إجتماع مكة) دەبێ و، یەکەمین کەس ئەو پەیمان (میثاق)ە دە بڕگەییە ئیمزا دەکات، کە لەلایەن ژمارەیەکی زۆر لە زانایان و کەسایەتییە دیارەکانی سوننە و شیعەی عێراقەوە سازکرابوو، بەمەبەستی کۆتایی پێهێنانی کوشتاری تایەفیی نێو عێراق.







## سێیەمین سەفەری حەج

هەر لەساڵی (٢٠٠٦)دا بۆ جاری سێیەم سەفەری حەج دەکات بە نیەتی حەج و عومرەکردن بۆ دایکی و، وێڕای بابی و باوژنی (ئەسمەرخان)، (شوکریە خانی) هاوسەریشی و، هەرکام لە (مامۆستا مەلا موحەممەدی ڕازی) خوا لێی خۆشبێ و (کاک مەلا مەڕوانی گەلاڵیی)یشی لەگەڵ دەبن.







## بەشداریی کردن لە (کۆنفرانسی پشتگیریی کردن لە خەڵکی فەلەستین)دا

لەساڵی (٢٠٠٧)دا لەگەڵ شاندێکی کۆمەڵی ئیسلامییدا لە تاران بەشداریی کۆنفرانسی پشتگیریی کردن لە خەڵکی فەلەستین دەکاتو، لەگەڵ (خالد مشعل)ی بەرپرسی مەکتەبی سیاسیی (حەماس) یەکدی دەبینن.



## دەستپێکردنی تەفسیری قورئانی بەپێز



لە یەکەم ڕۆژی مانگی ڕەمەزانی ساڵی ١٤٢٩ بەرانبەر: ٢٠٠٧/٩/١٣دا، لەشاری هەولێر دەستی کرد بەگوتنەوەو تۆمارکردنی دەرسەکانی: (تەفسیری قورئانی بەرزو بەپێز) لەسەرەتای موصحەفەوە لەسوورەتی (الفاتحە)ەوە.

بۆ بینینی سەرجەم دەرسەکانی تەفسیر سەردانی لینکی خوارەوە بکەن:



https://www.youtube.com/playlist?list=PL6HuvNeXiFwso-PnD1LAkIiZ6j7GgR8q8G



## سەفەرێك بۆ تورکیا بۆ چارەسەری بارگرژیی نێوان هەرێم و تورکیا

لە (٢٠٠٧/١١/١٠) لەگەڵ شاندێکی ئەنجوومەنی باڵای پارتە سیاسییەکانی هەرێمی کوردستاندا، کە نوێنەری: پارتی کاك (عزالدین بەرواریی) و، یەکیێتی کاك (ئەرسەلان بایز) و، ئەمینداری یەکگرتووی ئیسلامیی (مامۆستا صلاح الدین) و، سکرتێری حیزبی سۆشیالیست کاك (محمدی حاجی محمود) دەبن، دەچێتە تورکیاو، لەگەڵ هەریەك لە وەزارەتی دەرەوەی تورکیاو (د. أحمد داود أغلو) ڕاوێژکاری سەرۆك وەزیران و، جێگری (رجب طیب أردوغان) لەحیزبدا، (ئەگەمەن باغش) کۆدەبنەوە و، ئامانج لە سەفەرەکەش خاوکردنەوەی بارگرژیی نێوان هەرێمو تورکیا دەبێ و، ئەنجامی سەفەرەکەش ئیجابیی دەبێ.








## سەفەرێك بۆ ئێران



لـــــە (٧ / ١٢ / ٢٠٠٧)دا سەرۆکایەتی شاندێکی ئەنجوومەنی باڵای پارتە سیاسییەکان دەکات، کە ئەم بەڕێزانەی تێدا دەبن: لە پارتی کاك (مەلا محمد مەلا قادر) و، لە یەکیێتی کاك (ئەرسەلان بایز) و، لە یەکگرتووی ئیسلامیی (مامۆستا صلاح الدین) و، لە حیزبی زەحمەتکێشان کاك (قادر عزیز) و، لە حیزبی سۆشیالیست کاك (محمدی حاجی محمود)، کە دەچێتە تاران بۆ هەمان مەبەستی پێشوو و، هەرکام لە (هاشمی ڕەفسەنجانیی) و (منوچهر متکی) وەزیری دەرەوەو (سعیدی جلیلی) بەرپرسی ئەنجوومەنی ئاسایشی نەتەوەیی ئێران و (سردار سلیمانی) بەرپرسی سوپای قودس و، چەند بەرپرسێکی دیکە دەبینن و، سەفەرەکەش ئەنجامی باشی دەبێ.





## پێشکەش کردنی بەرنامەی سەرنج

لەنێوان (٢٠٠٨/١٢/٢٧) تاکو (٢٠١١/٤/٢٢) زنجیرە بەرنامەیەکی هەفتانەی (٨٠) ئاڵقەیی پێشکەش کرد بەناوونیشانی: (ئیسلام و دەوڵەتدارییی)، لەکەناڵی ئاسمانیی پەیام، بەشێکی لەگەڵ کاك (عومەر گوڵپیی)و هەندێك لەگەڵ کاك (هاوژین عمر)و زۆربەشی ڕاستەوخۆو بەتەنیا، کە دواتر لەمەوسووعەیەکی چوار بەرگییدا چاپ کرا.



لینکی سەرجەم بەرنامەکان لە یوتیوب:



https://www.youtube.com/playlist?list=PL6HuvNeXiFwsR-rvLP2fzdJafPjiQwZlOA



## ٤٧ سازکردنی میهرەجانێك بۆ پشتگیریی مسوڵمانانی غەززە

بەبۆنەی پشتگیریی و هاوسۆزیی پیشاندان بۆ مسوڵمانانی کەرتی غەززە و، ئیدانەکردنی هێرشی دڕندانەی قەوارەی جوولەکە، کۆمەڵی ئیسلامیی و یەکگرتووی ئیسلامیی پێکەوە لەهۆڵی (های سیتی) لەشاری هەولێر لە (٢٠٠٩/١/٥)دا گردبوونەوەیەکیان ساز کردو، هەرکام لە ئەمینداری یەکگرتوو و ئەمیری کۆمەڵ، سەرو وتاریان تێدا پێشکەش کرد.



تەواوی میهرەجانەکە لەو لینکەی خوارەوە ببینە:




https://youtu.be/Wdl8F2DKT3o?t=11



## سێیەمین هاوسەرگیریی

لە: ٢٠٠٩/١٢/٢٨دا هاوسەرگیریی لەگەڵ هاوسەری سێیەمی: (بێگەرد محمد حسن)دا دەکات، لەشاری سلێمانیی.



## خولێك لەبارەی سیرەو ژیانی پێغەمبەر "صلی الله علیه وسلم"



لە ساڵی (٢٠٠٩) دا خولێك لەمەڵبەندی هەولێردا دەکاتەوەو، بە پەنجاو دوو دەرس باسی (پوختەی ژیاننامەی پێغەمبەری خوا و "صلي الله عليه وسلم" دەرس و پەندەکانی) دەکات، کە دواتر لەژێر هەمان ناوونیشاندا لەدوو توێی کتێبێکدا چاپ دەکرێن.

لینکی سەرجەم دەرسەکان لە یوتیوب:


https://www.youtube.com/playlist?list=PL6HuvNeXiF-wsQnWaDDI8LoQdwQULHBhfN&disable_polymer=true

www.alibapir.net




## هەڵبژێرران بۆ ئەنجوومەنی نوێنەرانی عێراق

لە ٢٠١٠/٣/٧دا کاندیدی کۆمەڵی ئیسلامیی دەبێ و، لەسەر بازنەی پارێزگای هەولێر بۆ ئەنجوومەنی نوێنەرانی عێراق و، یەکەمی سەرجەم لیستەکان دەبێ و، زیاتر لەشەست هەزار (٦٠،٠٠٠) دەنگ دێنێ.





## ٥١ کردنەوەی خولی: ڕوونکردنەوەی بنەما شەرعییەکان و هێڵە گشتییەکانی کۆمەڵی ئیسلامیی

لەشەوی: ٢٠١٠/٥/١٧ تاکو ٢٠١٠/٨/٢٥دا لەشازدە (١٦) دەرسی هەفتانەدا، زنجیرە وانەیەك بەو ناوونیشانەی سەرێ، دەڵێتەوە لەنووسینگەی ئەمیر لەشاری هەولێرداو، دوای ئەوەی بەسی و شەش (٣٦) ئاڵقە لەهەفتەنامەی کۆمەڵدا بڵاوکراونەوە، لەژێر هەمان ناوونشاندا، لەدوو توێی کتێبێکدا چاپ کران.



لینکی سەرجەم دەرسەکان لە یوتیوب:




https://www.youtube.com/playlist?list=PL6HuvNeXiF-wtXkziT5wf0iT_DQ4AaB3s8




## کۆنگرەی دووەمی کۆمەڵی ئیسلامیی

لە ٢٠١٠/٧/١٥دا کۆنگرەی دووەمی کۆمەڵی ئیسلامیی دەبەسترێ و، هەرچەندە زۆر داکۆکیی دەکات لەسەر وازهێنانی لە ئەرکی ئەمیرایەتیی و، یەکلابوونەوەی بۆ ئەرکی پەرلەمانتاریێتیی لەئەنجوومەنی نوێنەرانی عێراق، بەڵام بۆ جاری دووەم هەڵی دەبژێرنەوە.



لینکی کۆنگرەی دووەمی کۆمەڵی ئیسلامیی لە یوتیوب:




https://youtu.be/iqi8FB63K6Y



## ٥٣ دووجار بانگهێشتکرانی بۆ دیاربەکر (ئامەد) لە تورکیا

هەر لەوماوەیەشدا دووجاران لەلایەن هەندێك کەسایەتیی و ڕێکخراوی مەدەنییەوە، بانگهێشت کرا بۆ شاری دیار بەکر (ئامەد) لە وڵاتی تورکیا، جاری یەکەم لە ٢٠١٠/٧/٢٣دا هاوڕێ لەگەڵ مامۆستا حسن بابکر و، کاك ئارام قادر و، کاك أنور صباح، کە وتارێکی لەسەر چۆنیەتی چارەسەری کێشەی کورد پێشکەش کرد.

جاری دووەمیش لە ٢٠١١/٤/١٧دا کە وتارێکی لەبارەی مامۆستا مەلا سەعیدی نوورسییەوە پێشکەش کرد، شایانی باسە لەو سەردانەدا هەرکام لە مامۆستا ناظم عبدالله و، کاك إبراهیم محمد عزیزو، کاك حیدر مظفر هاوڵی بوون.







بۆ دەقی وتارەکەی لەبارەی مامۆستا مەلا سەعید نوورسییەوە، بڕوانە:



https://youtu.be/_k7d_GEVdQo?t=15



## ٥٤ چاوپێکەوتنێکی شەش ئاڵقەیی بەزمـانی عـەرەبیـی

لە ڕۆژانی ٤ و ٥ /١٠/ ٢٠١١ز دا چاوپێکەوتنێکی شەش ئاڵقەیی لەگەڵ (د. عزام التميمي) لە کەناڵی ئاسمانیی (الحوار)دا دەکات، کە یەکەمین چاوپێکەوتنی عەرەبیی گشتگیر بووە لەگەڵیدا.



لینکی بەرنامەکان لەیویتیوب:




https://www.youtube.com/playlist?list=PL6HuvNeXiFwsp-SuVMWzIHoDkMpT9TB-_B




## پێشکەشکردنی نەخشە ڕێگایەك بۆ چارەسەری قەیرانی عێراق، لەئەنجوومەنی نوێنەران

لەڕۆژی: ٢٠١١/١٠/١٠دا لە کۆنگرەیەکی ڕۆژنامەوانییدا لە ئەنجوومەنی نوێنەرانی عێراق، بابەتێکی بەناوونیشانی: (أزمة العراق وطريق الخروج منها) (قەیرانی عێراق و ڕێی لێ دەربازبوونی)دا پێشکەش بەڕای گشتیی کرد، کە نەخشە ڕێیەکی سێزدە خاڵییە بۆ پەنجە خستنە سەر کێشەو قەیرانەکانی عێراق و ڕێباز و شێوازی چارەسەرکردنیان.



لینکی کۆنگرە ڕۆژنامەوانییەکە لە یوتیوب:




https://youtu.be/e8TFFh0a7N4

https://youtu.be/Xn4ZWv9t4Co



## سەفەرێك بۆ كەمبۆدیا و مالیزیـا



لە ٢٠١٠/١١/٢٩ دا لەگەڵ مـامۆسـتا دارا محـمـد أمین دا، (شـاندی یـەكگرتـووش: مـامۆستا عـمـر عبدالعـزیز و، كاك نجیب عبدالله بوون)، بەشداریی كرنگرەی پەرلەمانتارە ئاسیاییەكان دەكات، لە پایتەختی كەمبۆدیا (پنومنە) و وتارێك پێشكەش دەكات و، سەردانی شاری (كوالالامپۆر) پایتەختی مالیزیاش دەكەن و، چاویان بەچەند كەسایەتییەكی ناودار دەكەوێ.






## سەفەرێك بۆ ئەڵمانیا

لە ٢٠١٢/١/٢٨زدا (شوکریە خان)ی هاوسەری و (پیرۆزە خان)ی کچی بەمەبەستی چارەسەر دەبات بۆ ئەڵمانیا، هاوڕێ لەگەڵ کاك (عبدالستار مجید) و، بەهەرکام لە فەڕەنساو هۆڵەندادا ڕەت دەبن و، لە شاری (بەرلین) بەشی نۆیەم و کۆتایی لە کتێبی: (ڕێگای صالح بوون و بەرەو خواچوون) بۆ چاپی پێنجەم دەنووسێ و، چەند کۆڕو دیدارێکی بۆ ساز دەکرێن، لەچەند شارێکی ئەو وڵاتەدا، گرنگترینیان ئەو وتارەیە کە لە ڕۆژی: (٢٠١٢/٢/٢٣)دا لەشاری (بەرلین) پایتەختی ئەڵمانیا، پێشکەشی کردوە لە کۆڕێکدا بەناوونیشانی: (ئەرکی سەرشانمان لەهەرێمی کوردستان و عێراق و لێرە).



## کۆچی دوایی بابی



لە ڕۆژی ٢٠١٢/٣/٢٨ ز دا، بابی کۆچی دوایی کرد لەتەمەنی (٨٥) ساڵییدا لەقەزای ڕانیە.

حاجی باپیر لە دایکبووی ساڵی (١٩٢٧) بوو، لەگۆڕستانی (بەستە هیزە)ی ڕانیە بەخاك سپێردرا، خوا لێی خۆشبێ و جێگای بەهەشت بێ.

مەراسیمی بەخاك سپاردن و پرسەکەی لەم لینکەی خوارەوەیە:



https://youtu.be/cipGIAq6CXU?list=PL6HuvNeXiF-wvOgqtjZ27ylyUFpbqaqMMm&t=36



## وتارێك لەكۆنگرەیەكدا كە لەبەیرووتی پایتەختی (لبنان) بەستراوە

لە ڕۆژی: ٢٠١٢/١٢/١٨دا وتارێكی نارد بەناوونیشانی: (القضية الكوردية وطريق حلها)، كە لەو كۆنگرەیەدا لەلایەن ماموستا (ڕێبوار حەمەد)ەوە خوێندرایەوەو، كۆنگرەی ناوبراویش لەلایەن: (مركز القدس للدراسات السياسية)ەوە بەسترابوو و، ماموستاش بانگهێشت كرابوو، بەڵام بۆی نەلوا خۆی بچێ.





## ٦٠ چاوپێکەوتنێکی چوار ئاڵقەیی لەگەڵ کەناڵی ( NRT ) دا

لە ڕۆژانی: (٣ و٢٠١٣/٥/٢٠)دا (فیصل إبراهیم) چاوپێکەوتنێکی چوار ئاڵقەیی لەبەرنامەی: (ڕووداو و مێژوو)دا لەگەڵ ئەنجامدا، کە وێڕای باسکردنی چەند وێستگەیەکی مێژوویی ژیانی، بەتایبەت لەخەباتی شاخ و شار، ئاماژەی بەچەند بابەتێکی فیکریی و، چەند پرسێکی سیاسیی و کۆمەڵایەتییش کرد.




بۆ بینینی سەرجەم بەرنامەکان، سەردانی لینکی خوارەوە بکەن:



https://www.youtube.com/playlist?list=PL6HuvNeXiF-wuIqTaR2Y5-rNUCHjUi2ZpU

## ٦١ وتارێك لەگردبوونەوەیەکی جەماوەریی فراواندا لــە شاری هەولێر، بۆ پشتگیریی ئیسلامییەکانی (مصر) لەبەرانبەر کودەتاچییەکاندا

شایانی باسە ئەو گردبوونەوە جەماوەرییەش لەلایەن کۆمەڵی ئیسلامیی و یەکگرتووی ئیسلامییەوە سازکرابوو لەڕۆژی: (۲۰۱۳/۸/۱۷)داو، هەرکام لە: د. عەلی قەرەداغیی و، مامۆستا موحەممەد فەرەج و، خۆی، وتەیەکیان تێدا پێشکەش بەجەماوەرەکە کردو، کەناڵی (الجزیرة مباشر)یش ڕاستەوخۆ سەرجەم مەڕاسیمەکەی گواستەوە.

وتــارەکە لــەو لینکــەی خوارەوەدا ببینە:

You Tube https://youtu.be/gBQYdjNLoNM?t=2



## چاوپێکەوتنێك لەگەڵ کەناڵی: (الشرقية نيوز)دا

لە ڕۆژی: (٢٠١٤/٢/١٥)دا لەشاری هەولێر چاوپێکەوتنێکی دوو ئاڵقەیی لەگەڵ کەناڵی (الشرقية نيوز) لەبەرنامەی: (طبعة محدودة) ئەنجامدا، لەو بەرنامەیەدا کۆمەڵێك باس و خواسی جۆراو جۆریان تێدا کران لەبوارەکانی: فیکریی و سیاسیی و کاری ڕێکخراوەیی و حاڵ و باڵی ئۆمەت و تەوژمی ئیسلامیی تێیدا.



بۆ بینینی هەردوو ئاڵقەکە سەردانی لینکی خوارەوە بکەن:



https://youtu.be/na8EjszkLZM



## ٦٣ وەرگرتنی خەڵاتی کەسایەتیی ساڵی: ٢٠١٣

لە: (٢٠١٤/٤/٥)دا سەنتەری گەرمیان بۆ ڕاپرسیی، خەڵاتی ساڵی (٢٠١٣)ی پێ بەخشی، لەبەرانبەر نێوەندگیریی و دروستکردنی ئاشتیی لەنێوان حیزبە کوردستانییەکانی هەرێمدا.




بۆ بینینی مەڕاسیمەکە، سەردانی لینکی خوارەوە بکەن:


https://youtu.be/fcuOKT9pcFc?t=3



## ٦٤ زنجیرەیەك وانە لەبارەی تەزکیەی نەفسەوە، لەکەناڵی (پەیام)دا

لە یەکەم ڕۆژی مانگی ڕەمەزانی ساڵی (١٤٣٥) ك بەرانبەر (٢٠١٤/٦/٣٠) دەستی کرد بە پێشکەشکردنی زنجیرە دەرسی: (چاك خواپەرستن و خۆ پاك و چاك کردن) و سەرجەم (٣٠) ئاڵقە دەرچوو و لەکەناڵی ئاسمانیی (پەیام)ەوە، لەسی (٣٠) شەوەی ڕەمەزاندا پێشکەش کرا.



بۆ بینینی سەرجەم دەرسەکان، سەردانی لینکی خوارەوە بکەن:


https://www.youtube.com/playlist?list=PL6HuvNeXiFw-sUM2nDjzuWwzPJRTAlJLwb



## ٦٥ سەفەرێك بۆ وڵاتانی ئەسکەندنافیا



لە ٢٠١٤/٧/٣٠دا هاوڕێ لەگەڵ کاك (عبدالستار مجید) و (شەریف)ی کوڕیدا کە بۆ چارەسەر دەیبات، سەردانی هەرکام لە: فنلەندا و سوید و نەرویج دەکات و، لەهەرکامێکیاندا کۆڕێك یان زیاتری بۆ ئامادە دەکرێ، بەتایبەت لەشاری (تورکۆ)ی (فنلەندا)و، (ستۆکهۆڵم) پایتەختی (سوید) و هەردووك شاری (ڤیستەروس) و (یوتوبوری) هەر لەسوید و، (ئۆسلۆ) پایتەختی (نەرویج)، وێڕای ژمارەیەك سەردان و دیداری هەمەجۆرو، دە (١٠) ڕۆژیان پێ دەچێ.







## ٦٦ دەوامی ئەنجوومەنی نوێنەراندا لەبەغدا

شایانی باسیشە کە لەماوەی چوار ساڵی ڕەبەقدا (٢٠١٠-٢٠١٤) سەرگەرمی سەفەری نێوان هەولێر و بەغدا دەبێ، بۆ دەوامی ئەنجوومەنی نوێنەران و، لەکاتەکانی دەست بەتاڵییشدا سەرگەرمی پێداچوونەوە بۆ چاپکردنی مەوسووعەی: (الإسلام كما يتجلّى في كتاب الله) دەبێ، وێڕای تۆمارکردنی چەند دەرسێك لە تەفسیرە کوردییەکەی (تەفسیری قورئانی بەرزو بەپێز).





## ٦٧ دیدار لەگەڵ ژمارەیەك كەسایەتییدا لە بەغدا

هەروەها لەماوەی ئەوچوار ساڵەی دەوامی ئەنجوومەنی نوینەران لەبەغدا، گەلێك كەسایەتیی، زیاتر لەجارێك بینیون، بۆ نموونە:

١- سەرۆك كۆماری عێراق: مام جەلال تاڵەبانیی.



٤- د. ئیبراهیم جەعفەریی.



٥- شێخ إبراهيم النعمة.



٦- سەرۆکی ئەنجوومەنی نوێنەران: ئوسامە نوجیفیی.

٧- د. أحمد چلبي.

٨- د. ناجي شلغم، نوێنەری کۆمکاری عەرەبیی لەعێراق.



## ٦٨ بەشداریی لە دیداری (مێری)دا

لەڕۆژی: (٢٠١٤/١١/٦)دا بەبانگهێشتی (مؤسسة الشرق الأوسط للبحوث) بەوتارێکی عەرەبیی بەشداریی کرد لەبابەتی: (الحالة الإنتقالية في الشرق الأوسط: ضرورة الحوار والمصالحة).

شایانی باسیشە وتارەکەی لەنامیلکەیەکدا بەناوونیشانی: (حديث مختصر حول ما يجري على الساحة العراقية)دا بڵاوکراوەتەوە.




دەقی وتارەکە لە یوتیوب:




https://youtu.be/rg4Pjd7p_Ss?t=2



## ٦٩ چاوپێکەوتنێکی سێ ئاڵقەیی لەگەڵ کەناڵی (بغداد)دا

لەڕۆژی: (٢٠١٥/٣/٧)دا چاوپێکەوتنێکی سێ ئاڵقەیی لەگەڵ کەناڵی (بغداد)دا لە بەرنامەی: (في عمق المألوف) ئەنجامدا لە شاری هەولێر، لەلایەن پێشکەشکرار (نداء زقزوق)ەوە، لەو چاوپێکەوتنەدا وێڕای تیشک خستنە سەر چەند وێستگەیەکی ژیان و بەسەرهاتی، کۆمەڵێك بابەتی فیکریی و سیاسیی و کۆمەڵایەتیی و پەروەردەییش خراونە بەرباس و لێکۆڵینەوە




هەرسێ ئاڵقەکە لەو لینکەی خوارەوەدان:




https://www.youtube.com/playlist?list=PL6HuvNeXiFw-sTDAF5dLPoGLejcDL99i8K



## ٧٠ بەشداریی لەکۆنفرانسی (الموصل: قلعة الإسلام والتعايش)دا

لەڕۆژی: (٢٠١٥/٣/٢٥)دا بەبانگهێشتی پارێزگاری موسڵ، بە وتارێك بەشداریی لەوکۆنفرانسەدا کرد، کە لەژێر ناوونیشانی: (الموصل: قلعة الإسلام والتعايش)دا بەسترا، ئەو وتارەش لەنامیلکەی: (حديث مختصر حول ما يجري على الساحة العراقية)دا بڵاوکراوەتەوە.



دەقی وتارەکە لەیوتیوب:



https://youtu.be/RkI23DhKea0?t=2




## چاپکرانی مەوسووعەی: (الإسلام كما يتجلى في كتاب الله)

لەساڵی ٢٠١٥دا چاپی یەکەمی مەوسووعەی: (الإسلام كما يتجلى في كتاب الله) کرا، لە هەشت بەرگدا لەلایەن (مؤسسة الضحى) و (مكتبة الغرباء)ەوە.








## ٧٢ کۆنگرەی سێیەمی کۆمەڵی ئیسلامیی و هەڵبژێررانەوەی بە ئەمیر بۆ جاری سێیەم

لە ٣٠-٥/٣١ و ٢٠١٥/٦/١دا کۆنگرەی سێیەمی کۆمەڵی ئیسلامیی لە هەولێر بەستراو بەیەکدەنگیی و بۆ جاری سێیەم بە ئەمیری کۆمەڵ هەڵبژێردرایەوە.



وتارەکەی لەو کۆنگرەیەدا لەو لینکەی خوارەوەدایە:




https://www.youtube.com/playlist?list=PL6HuvNeXiFwty-bK9r6VSAdCuFJnMvCOPl

## ٧٣ گوتنەوەی زنجیرە دەرسی: (ئاکارە پەسندەکان)

لە یەکـــەم ڕۆژی مـــانگی ڕەمەزانی ســـاڵی: (١٤٣٦) ك بەرانبـــەر: (٢٠١٥/٦/١٨)ز دا دەستی کرد بە پێشکەشکردنی زنجیرە دەرسێك لەبارەی ڕەوشت و ئاکارە پەسندەکانەوە، کە (٣٠) ئاڵقەبوو و لە کەناڵی ئاسمانیی (پەیام)ەوە، لەسی شەوەی ڕەمەزاندا پێشکەشکرا.



سەرجەم دەرسەکان لەو لینکەدان:


https://www.youtube.com/playlist?list=PL6HuvNeXiF-wtwO-0oSnps3NfQNINYVuPp




## بەشداریی لە پازدەیەمین کۆنگرەی نەتەوەیی کوردستاندا

لە ڕۆژی: ٢٠١٥/٩/٢٥دا لەسەر بانگهێشتی (knk) هاوڕێ لەگەڵ کاک (عبدالستار مجید)دا لە ڕێی ڤیەننا (پایتەختی نەمسا) وە چووە (هۆڵەندا) و لەوێشەوە بۆ (برۆکسڵ)ی پایتەختی (بەلجیکا) بۆ بەشداریی کردن لە کۆنگرەی (١٥)ی کەنەکەداو، بەو بۆنەیەوە وتارێکی پێشکەش کرد.








## چاپی دووەمی مەوسووعەی (الإسلام كما يتجلى في كتاب الله)

لە ساڵی (٢٠١٦) دا دەستکرا بە چاپی دووەمی مەوسووعەی: (الإسلام كما يتجلى في كتاب الله) لە (١٢) دوازدە کتێبدا، کە زیاتر لە چوار هەزار (٤٠٠٠) لاپەڕەن، لەلایەن (دار الحكمة / لندن)ەوە.

هەروەها هەر لەم ساڵەدا دەستکرا بە وەرگێڕانی مەوسووعەی ناوبراو بۆ زمانی فارسی و کتێبی یەکەمی لێ چاپ و بڵاوکرایەوە.








## ٧٦ دیبەیتی ساڵ

لە: (٢٠١٦/٤/١٠)دا دیبەیتی ساڵ (دیموکراسیی و سیکولاریزم لە ئەزموونی کوردستاندا) لەنێوان ئەو و کاك مەلا بەختیار لێپرسراوی دەستەی کارگێڕیی مەکتەبی سیاسیی یەکێتی نیشتیمانییدا بەڕێوەچوو، لە هۆڵی تەوار لە شاری سلێمانیی، بەسەرپەرشتیی: (خانەی زانستە مرۆییەکانی پاریس).

دواتریش لەساڵی (٢٠١٦)دا لە دوو توێی کتێبێکدا بەهەمان ناوونیشان چاپکراو، پاشان وەرگێڕدرایە سەر زمانی عەرەبیی و چاپ و بڵاوکرایەوە.




لەو لینکەی خوارەوەدا، تەواوی دیبەیتەکە ببینە:



https://youtu.be/I0nv7kpBGX4?t=1




## بانگهێشتنێك بۆ شاری (مالاطیا) لە توركیا






لە ٢٠١٦/٥/٩دا بەبانگهێشتی فەرمیی شارەوانیی (مالاطیا)ی توركیا و بەبۆنەی وەرگێڕانی كتێبی: (چەند مەسەلەیەكی باوی سەردەم) بۆ زمانی توركیی و ڕانواندنی لەپێشانگا، لەلایەن چاپخانەی: (چرا)وە، سەفەری ئەو شارەی كرد، هاوڕێ لەگەڵ كاك حاجی (فاروق علي) و كاك (حیدر مظفر)دا.

بینینی سەردانەكە لە لینكی خوارەوەدایە:




https://youtu.be/br5TbkTl1nc?t=1



## بەرنـــامەی بەدانـــایی

لە ٢٠١٦/٧/٢٢ تاکو ٢٠١٧/٥/١زدا زنجیرە چاوپێکەوتنێکی (٢٠) ئاڵقەیی لەلایەن کاك (دانا محمد)ەوە، لەکەناڵی (پەیام)دا لەگەڵدا کرا، لە ژێر ناوونیشانی: (بۆ چارەسەری واقیعی ئێستامان با گوێ لە قورئان بگرین) دا، کە ئێستا کەناڵی پەیام سەرگەرمی ئامادەکردنیەتی بۆ چاپ لەدوو توێی کتێبێکدا.



لینکی سەرجەم ئاڵقەکان لە یویتیوب:




https://www.youtube.com/playlist?list=PL6HuvNeXiFwt-JHnTMr3LtTfQi2Hce2vfw




## وتارێك لە (١٦)ەمین (کۆنگرەی نەتـەوەیی کوردســتان)دا

لە ڕۆژی: (٢٠١٦/٩/٣٠)دا وتارێکی بۆ شازدەمین کۆنگرەی: (knk) کە لە (برۆکسل)ی پایتەختی (بەلجیکا) بەسترا، ناردو، لەلایەن کاك (کوردۆ ئەحمەد)ەوە خوێندرایەوە.






## گوتنەوەی (٤٩) وانــە، لەبــارەی (بیرکردنەوەی ئیسلامیی)یەوە

لە ٢٠١٦/١٠/٢١ تاکو ٢٠١٧/٥/٥، لەهەردووك شاری هەولێرو سلێمانیی (٤٩) وانەی گوتەوە لەو خولەدا کە (ناوەندی ڕاهێنان و گەشەپێدان) کردبوویەوە بۆ نیزیکەی سەد (١٠٠) براو خوشکی کادیر، لەژێر ناوونیشانی: (بیرکردنەوەی ئیسلامیی لەنێوان وەحیی و واقیعدا).



لینکی سەرجەم وانەکان لە یوتیوب:




https://www.youtube.com/playlist?list=PL6HuvNeXiF-wuuTQtJAAuWqXQoCnKQqX2X




## فراوانترین چاوپێکەوتن بەزمانی عەرەبیی







لە نێوان: (١٤-١٩ / ١٢ / ٢٠١٦) و (٥-٨ / ٤ / ٢٠١٧)ز دا ڕۆژنامە نووسی میسریی (السيد عبدالفتاح السيد) بەڕێوەبەری (مركز القاهرة للدراسات الكوردية)، هەڵسا بەئەنجامدانی گفتوگۆیەکی سی و سێ (٣٣) ئاڵقەیی لەماوەی شازدە سەعات و نیودا، کە دوایی لە دووتوێی کتێبێکدا بەناوونیشانی: (حوارات ساخنة حول قضايا راهنة، في ميادين: الفكر والفقه والدعوة والسياسة)دا چاپکرا.

سەرجەم ئاڵقەکان لەو لینکەدان لە یوتیوب:




https://www.youtube.com/playlist?list=PL6HuvNeXiF-wsN5LNz28N60fFup8jMDSRo



## ٨٢ وتارێك بۆ بەرگریی کردن لە مسوڵمانانی ستەمدیدەی هەرێمی ئەراکان لە (بۆرما)

لە: (٢٠١٧/٩/١٠) لەگردبوونەوەیەکی جەماوەرییدا، لەهەولێر بەوتارێك بەشداریی کرد لەبارەی چەوسێنرانەوەی مسوڵمانانی (روهینغا)وە، لەوڵاتی: (بۆرما - میانمار)دا، هەم وەك پێناسەیەکی مێژوویی و جوگرافییان و، هەم وەك ڕاددەی ئەو ستەم و قەڵاچۆکردنەی لەلایەن ڕژێمی بۆرماوە ڕووبەڕووی بوونەوە، کە نەتەوە یەکگرتووەکان بەچەوساوەترین کەمینەی جیهان ئەژماری کردوون.





بۆ بینینی تەواوی گردبوونەوە جەماوەرییەکە، سەردانی لینکی خوارەوە بکەن:



https://youtu.be/G5x1PEg-r84?t=1




## بەشداریی لە حەڤدەمین کۆنگرەی (knk)

لە ڕۆژی: (٢٠١٧/١٠/١٤)دا بەوتارێك بەشداریی (١٧)ەمین کۆنگرەی (knk)ی کرد، بەناوونیشانی: (گەلی کوردو ئەرك و هەنگاوە گرنگەکانی لەم قۆناغەدا) کە لەلایەن کاك (سامان ڕەباتیی)یەوە خوێندرایەوە لە هۆڵەندا.






## یەکەمین وتاری لەبارەی ڕیفراندۆمەوە

ڕۆژی ٢٠١٧/٧/١٧ز بەرانبەر ٢٣/شوال/١٤٣٨ك، بۆ یەکەمجار لە فەیسبووکەکەی خۆیدا لەژێر ناوونیشانی: (ڕیفراندۆم هەقە، بەڵام با بەشێوازێکی هەقیش جێبەجێ بکرێ)دا لەبارەی گشتپرسییەوە بڵاوکردەوە، زۆرێك لە کەناڵەکانی ڕاگەیاندنیش چەند بڕگەیەکیان لێ بڵاوکردەوە.

پوختەکەشی ئەوە بوو کە ڕیفراندۆم وەك شێوازو میکانیزمی بەرەو سەربەخۆیی چوون، مافێکی ڕەوایە، بەڵام جێبەجێ کردنی ئەو پرۆسەیەو مومارەسەکردنی ئەو مافە لە هەل و مەرجێکدا، کە لە نێوخۆداو نە لەگەڵ حکوومەتی نێوەندییداو، نە لەگەڵ دەوڵەتانی دراوسێداو، نە لە ڕووی نێو دەوڵەتییەوە، زەمینەسازیی بۆ نەکراوە، هەڵەیەو ئەگەری باجدانی گەورەی هەیە.




## دووەمین وتاری لە بارەی ڕیفراندۆمەوە

لە ڕۆژی ٢٠١٧/٨/١٣ز بەرانبەر ١٤٣٨/١١/٢١ك دا، لە پەیجەکەی خۆیدا بۆ جاری دووەم وتارێکی لەبارەی گشتپرسییەوە بڵاوکردەوە بەناوونیشانی: (کێشەکانی هەرێم لە نێوان (بەڵێ)و (نەخێر)دا).

پوختەکەشی ئەوەبوو، کە نە بە (بەڵێ) کردن بۆ ڕیفراندۆم دنیا دەبێتە شامی شەریف، وەك خەڵکێك بانگەشەی بۆ دەکەن، نە بە پێچەوانەوە، بە (نەخێر) گوتنیش وەك هەندێك لاف لێدەدەن، کێشە و گرفتەکانی هەرێم تێکڕایان چاسەرە دەبن.



## کۆبوونەوەی چەند سەعاتیی لەگەڵ یەکیەتی و پارتیدا، لەبارەی ڕیفراندۆمەوە

لە ڕۆژی دووشەممە ٢٠١٧/٩/١١دا سەرۆکایەتی شاندێکی کۆمەڵی ئیسلامیی کردو لەگەڵ شاندێکی یەکیەتی نیشتیمانیدا کۆبوونەوە، بۆ قسە کردن لەبارەی ڕیفراندۆم و ئەنجامدانیەوە، لەو کاتە دیاریکراوەدا، کە جارێ هیچ زەمینەسازییەکی نێوخۆیی و دەرەکیی بۆ نەکراوە، زۆریش داکۆکیی کرد، کە ئەو هەل و مەرجە گونجاو نیەو، ئەگەری زۆری هەیە بەهۆی ئەنجامدانی ڕیفراندۆمەوە، نەك هەر نەگەینە دەوڵەتی سەربەخۆی کوردستان، بەڵکو هەرێمەکەشمان بکەوێتە بەر هەڕەشەی لە بەین چوونەوە.





پاشان لە ڕۆژی سێ‌شەممە ٢٠١٧/٩/١٢دا سەرۆکایەتیی شاندێکی دیکەی کۆمەڵی ئیسلامیی کرد بۆ کۆبوونەوەیەکی سێ قۆڵیی لەگەڵ هەرکام لە شاندی (یەکیەتی نیشتیمانیی و پارتی دیموکرات)دا بۆ گفتوگۆکردن لەمەڕ پرسی ڕیفراندۆمەوە، لەو کۆبوونەوە سێ قۆڵییەدا کە نزیکی (٤) سەعاتی خایاند، داکۆکیی زۆر کرد لەسەر دواخستنی گشتپرسیی هەرێمی کوردستان و ئەنجامدانی لەو کات و هەل و مەرجە نەگونجاوەدا، بەڕوون و ڕاشکاویی ڕایگەیاند کە وێڕای تێبینیی و سەرنجی زۆرییان لەسەر میکانیزم و شێوازی بڕیار لەسەردرانی ڕیفراندۆم کە بەشێوەیەکی شەخسیی‌و حیزبیی بووە، ڕەخنەی جددیشییان لەسەر زەمینەسازیی بۆ نەکردنی ئەو پرۆسە نیشتیمانییە گرنگ و چارەنووسسازە هەیە، بەڵام هەستی کرد کە هەردووك لایان بە بڕیار بۆدراویی و دەست بەستراویی هاتوون بۆ کۆبوونەوەکە!

شایانی باسیشە هەردوو کۆبوونەوەکە لە بارەگای مەکتەبی سیاسیی یەکێتی نیشتیمانیی لەشاری هەولێر بەڕێوەچوون.



## ٨٧ چاوپێکەوتنێك لەگەڵ کەناڵی (ڕووداو) لەسەر پرسە هەنووکەییەکان بەگشتیی و پرسی ڕیفراندۆم بە تایبەتی

لە ڕۆژی ٢٠١٧/٩/١٧زدا کەناڵی ڕووداو چاوپێکەوتنێکی لەگەڵدا کرد لەبارەی پرسە هەنووکەییەکان بە گشتیی و پرسی ڕیفراندۆمەوە بەتایبەت، ئەویش بە ڕوون و ڕاشکاویی ڕایگەیاند کە هەرچەندە گەلی کوردستان چ



لە هەرێمی کوردستان - باشووری کوردستان -و، چ لە هەرکام لە بەشەکانی کوردستاندا - باکوور و ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوا - مافی خۆیەتی خاوەنی ئیرادەو ئیدارەی خۆی بێ بەدەوڵەتی سەربەخۆشەوە، بەڵام لەو بارودۆخەدا لە سۆنگەی

ئەوەوە کە زەمینەسازیی بۆ نەکراوەو بەشێوەیەکی شەخسیی و حیزبیش بڕیاری بۆ دراوە، ئەنجامدانی گشتپرسی لە هەرێمی کوردستاندا هەڵەیەو، ئەگەری دەرهاویشتەی زۆر خراپی لێ دەکرێت.

هەروەها گوتی: هەنگاونانێك جێ پێی خۆتی تێدا نەبینی، هەڵدێرانی بەدوادادێت.

دیسان گوتی: بڕیاری کەسێك بکەوێ باشترە نەك هەرێمەکەمان.

دیسان گوتی: ئێمە بەم حاڵەوە ڕیفراندۆمێکی سەرکەوتوومان بۆ ناکرێ، چونکە بارمان باری تریلەیەو تایەمان تایەی پایسکل!.

بۆ بینینی چاوپێکەوتنەکە، سەردانی لینکی خوارەوە بکەن:



https://youtu.be/HyK1Va_ZSZc?t=468



## ٨٨ بەشداریی کردن لە پرۆسەی دەنگدانی ڕیفراندۆمدا

ڕۆژی دووشەممە ٢٠١٧/٩/٢٥ز لە شاری هەولێر بەشداریی لە پرۆسەی ڕیفراندۆمدا کردو، دەنگیشی بە (بەڵێ)دا، بۆ هەنگاونان بەرەو سەربەخۆیی، پاشان چەند قسەیەکی کرد بۆ کەناڵەکانی ڕاگەیاندن، وەك:

• ئێمە ڕەخنەو تێبینیمان لەسەر شێوازی بڕیاردانی ڕیفراندۆم و هەل و مەرجی تێدا ئەنجامدانی هەبوو و، زۆریش لەو بارەوە قسەمان کرد، بەڵام بێگومان لە وەڵامی پرسیاری (ئایا سەربەخۆییت دەوێ؟) هەر بە (بەڵێ) وەڵام دەدەینەوە.



• هیواداریین و لەخواش داواکاریین ئەو ڕیفراندۆمە ئامانجەکەی بپێکێ و، بەهۆیەوە بگەینە سەربەخۆیی.

• هیوادارین و لەخواش دەپاڕێینەوە ئەو ئەگەرە خراپانەی ئێمە بەهۆی ئەنجامدانی ڕیفراندۆمەوە چاوەڕێیان دەکەین و دڵمان لێیان دەترسێ، هیچیان نەیەنە دی و سەرەنجام بۆچوونی ئێمە هەڵە دەربچێ و خەڵك و جەماوەرمان تووشی زیانباری نەبێ!



بۆ بینینی بەشداریی کردن لە پڕۆسەی دەنگدانەکەو، دەقی کۆنگرە ڕۆژنامەوانییەکە، سەردانی لینکی خوارەوە بکەن:


https://youtu.be/kRKiMBHJ8J4?t=2



## ٨٩ کۆمێنتێکی کورت لەسەر ڕیفراندۆم

لە ڕۆژی ٢٠١٧/٩/٢٦ز بەرانبەر ١٤٣٨/١١/٢١ك دا بۆ وەڵامدانەوەی قسەی ئەوانەی ڕەخنەیان گرت لە (بەڵێ) کردنی بۆ سەربەخۆیی، ویڕای ڕەخنەگرتنی لە شێوازو کات و زەمینەی ڕیفراندۆم، کۆمێنتێکی نووسی بە ناو ونیشانی: (نەخێر بۆ حوکمڕانی لارو ستەمکار، بەڵێ بۆ سەربەخۆیی گەل و وڵات)، کە ئەمە دەقەکەیەتی:

ئەوانەی ناتوانن (نەخێر) بۆ حوکمڕانیی لارو ستەمکارو پڕ گەندەڵیی و پۆخەڵیی و، (بەڵێ) بۆ سەربەخۆیی وڵاتو دەوڵەتی کوردستان، لە عەقڵو دڵیاندا پێکەوە کۆبکەنەوە، شایستەی بەزەییو دڵ پێ سووتانن، چونکە مرۆڤی عەقڵ دەروون ساغ، هەمیشە لەگەڵ هەقە و دژی ناهەقە، نەك بەهۆی هەقەوە ناهەقیش قبوڵ بکات و لێی بێ دەنگ بێ، یان بە بیانووی دژی ناهەق بوونەوە، هەقیش ڕەفز بکات!

## ٩٠ وەڵامدانەوەی قسەیەکی کاك مەسعوود بارزانی

لە ڕۆژی: ٢٠١٧/٨/٢٢زدا لە وەڵامی قسەو پرسیارێکی کاك مەسعوود بارزانییدا: (نازانم کۆمەڵی ئیسلامیی لە چی نیگەرانە!) نووسینێکی لە پەیجەکەی خۆیدا بەم ناوونیشانە نووسیی، وەك وەڵامێك بۆ قسەو پرسیارەکەی ناوبراو: (وەڵامێکی دڵسۆزانە بۆ پرسیاری: کۆمەڵی ئیسلامیی لە چی نیگەرانە؟)، کە کورتەکەی ئەوەیە:

هۆکاری نیگەرانیی و گلەیی کۆمەڵی ئیسلامیی لە کاك مەسعوودو حیزبەکەی و دۆخی هەرێم، هیچ پەیوەندیی بە شتی شەخسییو حیزبییەوە نیە، بەڵکو ئەو هەڵوێستەی کۆمەڵی ئیسلامیی، پەیوەستە بەشێوازی حکومڕانیی و ئیدارەدانی پارتیی و یەکیەتی لە (بیستو شەش) ساڵی ڕابردوودا، کە هیچ کام لە: (سیستمێکی حوکمڕانیی تەندروست و، چەسپاندنی دادو، کاری دامەزراوەیی و، یاسا سەروەریی و، بەپێوەرگرتنی مرۆڤبوون و، هاوڵاتیی بوون بۆ مامەڵە لەگەڵ خەڵکداو، دابینکردنی ماف و ئازادییەکان) وەك پێویست بوونیان نەبووە.




## دەستکردن بە تۆمارکردنی بەرنامەی نووسین و یادەوەریی

لە ڕۆژی: (٢٠١٧/٩/٣١)دا دەستیکرد بەئەنجامدانی زنجیرەیەك چاوپێکەوتن لەگەڵ کاك (پەیوەند عومەر)دا بەناوونیشانی: (نووسین و یادەوەریی)، بەمەبەستی قسەکردن لەبارەی نووسین و بەرهەمە فیکرییەکانیەوە، ئامانج و هاندەریان و، هەل و مەرج و بارودۆخی سەرهەڵدانیان و، ئەو سەرگوزشتەو بیرەوەرییانەی پێیانەوە پەیوەستن.



کە هەتا ئێستا (١٦) ئاڵقەی لێ تۆمارو پێشکەش کراون و، هەرکام لە: (پوختەیەك دەربارەی ئیسلام) و (ئیسلام ڕێچکان) و (سۆزی نەتەوایەتیی وبیری ناسیۆنالیزم لە تەرازووی ئیسلام دا) قسەیان لەبارەوە کراوە. سەرجەم ئاڵقەکان لەو لینکەی خوارەوەدان:




https://www.youtube.com/playlist?list=PL6HuvNeXiFwub-9nCheHAn7Z67t7wr5_5f



## ٩٢ پەیامێکی دڵسۆزانە بۆ هەموو لایەك

لە ڕۆژی: ٢٠١٧/١٠/٣١ ز بەرانبەر ١١/صفر/١٤٣٨ك، لەپەیجی تایبەتی خۆیداو لەژێر ناوونیشانی: (پەیامێکی دڵسۆزانە بۆ هەموو لایەك)دا نووسینێکی بڵاوکردەوە، کە پێشتریش بەشێوەی ڤیدیۆیی لە ٢٠١٧/١٠/٢٨دا بڵاوی کردبۆوە لە چوار تەوەری سەرەکییدا، کۆمەڵێك بنەماو پڕەنسیپی گەورەو گرنگی گرتبوونە خۆی.

دیارە ئەو پەیامەش پاش نسکۆو شکستی (١٦)ی ئابی ٢٠١٧ز بوو، کە بەلایەکی بێڕەزابوو بەسەر هەرێمی کوردستان هاتەوە، نزیکەی نیوەی پانتاییە جوگرافییەکەی لەژێر کۆنترۆڵی دەسەڵاتی هەرێمدا نەما.

شایانی باسیشە ئەو پەیامە، وێڕای دیاریی کردنی هۆکارە دوورو نزیکەکانی ڕوودانی ئەو نسکۆو شکستە، باسی ڕێی دەربازبوون و، چەند ڕاستییەکی ڕێ ڕۆشن کەرەوەو، چەند بانگەوازێکیشی بۆ خەڵك و جەماوەرو لایەنە سیاسیەکان و حکوومەتی نێودنديی، گرتبوونە خۆی.

لە کۆتاییشدا ئەو ڕاستییەی دووپات کردبۆوە، کە بێ ئەنجام بوونی ڕیفراندۆم، مانای ئەوە نیە کە گەلی کوردستان دەستبەرداری مافی شەرعیی و ڕەوای خۆی - مافی چارەنووسی خۆبەدەست بوون (حق تقرير المصير) - بووە، بەڵکو ئەو مافەی هەر دەوێ، بەلام دەبێ بشزانێ کە مافی دیارییکردنی چارەنووس مەرج نیە تەنیا لە دەوڵەتی سەربەخۆدا بەرجەستە ببێ، بەڵکو هەر کام لە: ئۆتۆنۆمییەکی ڕاستەقینەو، فیدرالییو، کۆنفیدرالیش، چەند شێوەیەکی دیکەی بەرجەستە بوونی ئەو مافە ڕەوایەن بۆ گەلی کوردستان و، هەر گەلێکی دیکەی وەك ویش.

لینکی پەیامە ڤیدیۆییەکە: https://youtu.be/Z4ogS0w2QhA?t=1





## سەفەرێکی یەك مانگیی لەڕێی بەغداوە بۆ ئەڵمـانیـا و هۆڵـەندا و بەلجـیکا

لەڕۆژی پێنجشەممە ٢٠١٧/١١/٢ لەفڕۆکەخانەی هەولێرەوە بۆ بەغدای پایتەخت و، پاشان لە ٢٠١٧/١١/٣ لەبەغداوە بۆ بەرلینی پایتەختی ئەڵمانیا، بەڕێکەوت، بەمەبەستی چارەسەری هاوسەری (شوکریە خان)و دیدارکردنەوەی (شەریف)ی کوڕی بۆ پزیشك.

شایانی باسە لەو سەفەرەیدا، وێڕای هێنانەدی ئامانجی ناوبراو، چەند چالاکییەکی دیکەشی ئەنجامدان، گرنگترینیان:

١- بەستنی کۆڕێك لە بەرلین لە هۆڵی (دەرسیم)، لەشەوی: (٢٠١٧/١١/٢٣) دا لەژێر ناوونیشانی: (کێشەکانی کوردو هەرێمی کوردستان بەتایبەت)دا.

بۆ بینینی کۆڕەکە سەردانی لینکی خوارەوە بکەن:




https://youtu.be/ORmF1VymZ24

٢- سەردانی سەفارەتی عێراق لە بەرلین و، دیداری لەگەڵ سەفیرو جێگرەکەی و ژمارەیەك لەکارمەنداندا.



٣- بانگهێشتکرانی لەلایەن ژمارەیەك دۆست و برادەرەوە لەشارەکانی: (بەرلین و، راستەبۆرگ و، ڤوبەرتاڵ و، گیرزەلکێشن و، کۆڵن) لە ئەڵمانیا.





٤- سەردانکردنی بۆ هۆڵەندا و کۆبوونەوەی لەگەڵ ژمارەیەك لە کادیرو ئەندامانی کۆمەڵدا، لەشاری: (ئەپڵ دۆرن) کە وێڕای هۆڵەندا لە وڵاتانی: بەریتانیا و ئەڵمانیا و فەڕەنساوە، هاتبوون.








٥- سەردانکردنی بۆ (برۆکسل)ی پایتەختی بەلجیکاو، کۆبوونەوەی لەگەڵ ژمارەیەك لەئەندامانی باڵای (knk) داو، ئەنجامدانی چاوپێکەوتنێك لەگەڵ کەناڵی (sterk-tv) دا، لە ڕۆژی: (٢٠١٧/١١/٢٦)دا.

بۆ بینینی تەواوی چاوپێکەوتنەکە، سەردانی لینکی خوارەوە بکەن:




https://youtu.be/278Qn-J02sc?t=838

٦- ئەنجامدانی چاوپێکەوتنێك لەگەڵ بەشی کوردی دەنگی ئەمەریکادا، لەبەرلین، لەشەوی: (٢٠١٧/١١/٢٩)دا.

شایانی باسە ئەو چاوپێکەوتنە سەرو سەدایەکی زۆری بەدوای خۆیدا هێنا، بەتایبەت ئەم قسەیەی کە: (بەهۆی نەمانی پۆستی سەرۆکی هەرێمەوە، سەرئێشەیەکی زۆرمان لەکۆڵ بۆتەوەو ئیسراحەتمان کردوە).

بۆ دەقی چاوپێکەوتنەکە، سەردانی لینکی خوارەوە بکەن:




https://soundcloud.com/ali-bapir/mbiiwe69yyuj

٧- لەکاتی گەڕانەوەشیدا لە بەغدای پایتەخت لە ڕۆژانی: (٢و٣و٢٠١٧/١٢/٤) ژمارەیەك دیداری کردن لەگەڵ هەرکام لە بەڕێزانەدا:

أ- د. فوئاد مەعصوم، سەرۆك کۆماری عێراق.



ب- سەلیم الجبوري، سەرۆکی ئەنجوومەنی نوێنەران.




جـ- همام حمودي، سەرۆکی ئەنجوومەنی باڵای عێراقیی.



د- سید عمار الحکیم، ئەمینداری ڕەوتی حیکمەتی نیشتیمانیی.



لەسەرجەم دیدارەکاندا تەوەری سەرەکیی بریتیی بوو لەچۆنیەتی چارەسەرکردنی کێشە و گیرو گرفتەکانی نێوان حکوومەتی نێوەندیی و هەرێم، کە پێشتریش هەر هەبوون و ڕیفراندۆمەکەی (٢٠١٧/٩/٢٥)ش بوو بە سەربارییان!



## پەیامێك بەبۆنەی خۆپیشاندانەکانی: (٢٠١٧/١٢/١٩)ەوە

لەشەوی: (٢٠١٧/١٢/٢٠)دا لە کۆنگرەیەکی ڕۆژنامەوانییدا، لەشاری سلێمانیی، پەیامێکی بۆ خەڵك و جەماوەری کوردستان بڵاوکردەوە، بەبۆنەی ئەو خۆپێشاندانەوە، کە بەشێك لەشار و شارۆچکەکانی هەرێمی کوردستانی گرتنەوە و، بارگرژیی و تەق و تۆق و بریندار بوون و کوژران و گیرانی چەند کەسێکی لە کەوتەوە.

**لەوپەیامەدا جەختی لەسەر چەند شتێك کردەوە، وەك:**

١- کێشە و قەیرانە کەڵەکەبووەکانی هەرێم وەك: تەنگدەستیی و بێ مووچەیی و بێکاریی، تەنگیان بەخەڵك هەڵچنیوە و تۆوڕە و بێزاریی کردوون.



٢- هەموو جۆرەکانی خەباتی مەدەنی: مانگرتن، ڕێپێوان، خۆپێشاندان، بەشێوازی هێمانەنەو شارستانییانە، مافی ڕەوای خەڵك و توێژەکانی کۆمەڵگان.

٣- پێویستە خۆپێشاندەران وریا و هۆشیاربن و ڕێ نەدەن مومارەسەکردنی ئەو مافە ڕەوایەیان لا بەلاڕێدا ببرێ.

٤- پەنابردنە بەر توندوتیژیی لەهەرلایەکەوەبێ، تەنیا زیانباریی هەموولایەکی بەدواوەیە.

٥- ئەرکی حکوومەتە هەرچی زووتر بەدەم کێشەو گرفت و داواکارییەکانی خەڵکەوە بچێ و، دەبێ دام و دەزگا ئەمنییەکانیش بەجیددیی بەئەرکی سەرشانی خۆیان هەڵسن لەپاراستنی خۆپێشاندەران و پاراستنی موڵك و ماڵی تایبەتیی ءحیزبیی و حکوومیی.

بۆ بینینی پەیامەکە بەڤیدیۆ، سەردانی لینکی خوارەوە بکەن:



https://youtu.be/CWX6C-rh-ak?t=10




## هەتا نووسینی ئەم دێڕانەش لەسەر کاروچالاکییەکانی بەردەوامە

بەتایبەت تەفسیرە کوردییەکەی، کە گەورەترین پڕۆژەیەتی پاش مەوسووعەی: (الإسلام كما يتجلى في كتاب الله) و، هەتا ئێستا (١٣/ ڕەبیعی دووەمی/ ١٤٣٩ کۆچیی بەرانبەر: ٢٠١٧/١٢/٣١ زایینیی) گەیشتۆتە سووڕەتی (الحج)، کە لە جوزئی حەڤدەیە.

## أ - کتێبە کوردییەکان :

| ژ | کتێبەکان | بەرواری چاپ | تێبینی |
|---|---|---|---|
| قـورئـان و سـونـنـەت | | | |
| ١ | پوختەیەك دەربارەی ئیسلام لەبەر ڕۆشنایی سورەتی فاتیحەدا | چاپی یەك/١٩٨٤<br>چاپی دوو/٢٠٠٦ | |
| ٢ | با لە خزمەت قورئاندا بین، {کۆی هەردووك کتێبی: (چۆن باشتر لە قورئان بەهرەمەند دەبین؟)و (ئەرکی سەرشانمان بەرانبەر بە قورئان)ە} | چاپی یەك/٢٠٠٨<br>چاپی دوو/٢٠١٥ | |
| ٣ | تەفسیری قورئانی بەرزو بەپێز، بەرگی یەکەم: سووڕەتەکانی: (الفاتحة) و (البقرة) | چاپی یەك/٢٠١٢ | |
| ٤ | تەفسیری قورئانی بەرزو بەپێز، بەرگی دووەم : سووڕەتی: (آل عمران) | چاپی یەك/٢٠١٢ | |
| ٥ | تەفسیری قورئانی بەرزو بەپێز، بەرگی سێیەم: سووڕەتی: (النساء) | چاپی یەك/٢٠١٣ | |
| ٦ | تەفسیری قورئانی بەرزو بەپێز، بەرگی چوارەم: سووڕەتی: (المائدة) | چاپی یەك/٢٠١٤ | |
| ٧ | تەفسیری قورئانی بەرزو بەپێز، بەرگی پێنجەم: سووڕەتی: (الأنعام) | چاپی یەك/٢٠١٥ | |
| ٨ | تەفسیری قورئانی بەرزو بەپێز، بەرگی شەشەم : سووڕەتی: (الأعراف) | چاپی یەك/٢٠١٦ | |
| ٩ | تەفسیری قورئانی بەرزو بەپێز، بەرگی حەوتەم: سووڕەتی: (الأنفال) | چاپی یەك/٢٠١٦ | |
| ١٠ | تەفسیری قورئانی بەرزو بەپێز، بەرگی هەشتەم: سووڕەتی: (التوبة) | چاپی یەك/٢٠١٧ | |
| ١١ | تەفسیری قورئانی بەرزو بەپێز، بەرگی نۆیەم: سووڕەتی: (یونس) | چاپی یەك/٢٠١٧ | |
| ١٢ | شوێنکەوتنی سونەتی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) لەنێوان کەمتەرخەمیی و زێدەڕۆییدا | چاپی یەك/٢٠١٥ | |

| | | | |
|---|---|---|---|
| ١٣ | ڕێبازی پێغەمبەری خوا: پێناسەو گرنگیی و پێویستیی | چاپی یەکەم/٢٠١٨ | |
| | **بیـروبڕواو فیکـری ئیسـلامیی** | | |
| ١٤ | دەبەرێك ڕاچوونی ئیسـلام و ڕێچكان | چاپی یەك/١٩٨٥<br>چاپی سێ/٢٠٠٦ | |
| ١٥ | پرۆژەی بەرنامەی فیکریی کاری ئیسـلامیی | چاپی یەك/١٩٩٦ | |
| ١٦ | بنەما شەرعییەکان و هێڵە گشتییەکانی کۆمەڵی ئیسـلامیی | چاپی یەك/٢٠٠١<br>چاپی سێ/٢٠١٤ | وەرگێڕراوەتە سەر زمانی عەرەبییش |
| ١٧ | چەند مەسـەلەیەکی بـاوی سـەردەم، سـەرنجێکی واقیعیانەو هەڵسـەنگاندنێکی شەرعییانە | چاپی یەك/٢٠٠٢<br>چاپی شەش / ٢٠١٦ | وەرگێڕراوەتە سەر زمانی عەرەبی و تورکـیی و فـارسـییش |
| ١٨ | خواناسـیی، ئاییـن، ئیمان (ڕاسـتییەکانی ئیسـلام دەدرەوشێنەوەو ئەفسانەکانی ڕێچكان دەپووچێنەوە) | چاپی یەك/٢٠٠٢<br>چاپی دوو/٢٠٠٩ | |
| | مەوسـووعەی : ئیمان و عەقیدەی ئیسـلامیی لەبەر ڕۆشنایی قورئان و سـوننەتدا، (٦ بەرگ) | چاپی یەك/٢٠٠٦-٢٠٠٨ چاپی دوو/٢٠١٦ | |
| ١٩ | بەرگی یەکەم: ئیمان و عەقیدەی ئیسلامیی چیەو چۆنە؟ | | |
| ٢٠ | بەرگی دووەم: خوا بەیەکگرتن لە بەدیهێنەرایەتیی و پەروەردگارێتییدا | | |
| ٢١ | بەرگی سێیەم: خوا بەیەکگرتن لە ناو و سیفەت و لەپەرستراوێتییدا | | |
| ٢٢ | بەرگی: چوارەم: ئیمان بە: فریشتەکانی خوا، کتێبەکانی خوا، پێغەمبەرانی خوا | | |
| ٢٣ | بەرگی پێنجەم: ئیمان بە: ڕۆژی دوایىء قەزاو قەدەر | | |
| ٢٤ | بەرگی شەشەم: تایبەتمەندیی و دیدوبۆچوونەکانی پەیڕەوانی ڕێبازی ڕاست | | |

| | | | |
|---|---|---|---|
| ٢٥ | ڕێبـازی پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم کامەیە ؟! | چـاپی یەك/١٩٨٩ | دواتر خرایە نێو کتێبی (مسـوڵمانی کامڵ: بەشی یەکەم: بیروباوەڕی مسـوڵمان) |
| ٢٦ | سـوڵمانی کـامڵ : بەشی یەکـەم : بیـروباوەڕی مسـوڵمان | چـاپی یەك/١٩٩٧ | دواتر خرایە نێو کتێبی (ئیمان و عەقیدەی ئیسـلامیی لەبەر ڕۆشنایی قورئان و سـوننەتدا) |
| ٢٧ | تەوژمی ئیسلامیی و عەلمانیی و خاڵە هاوبەش و جیاوازەکانیان | چاپی یەك/٢٠٠٨<br>چـاپی سێ/٢٠١٥ | زۆربەی بە (٢٤) ئاڵقــە لە هەفتەنـامەی (هـاووڵاتیی) و، ئەوەی دیکەش بە (٩) ئاڵقە لە هەفتەنامەی (ئاوێنە)دا بڵاوکراوەتەوە |
| ٢٨ | ڕوونکردنەوەی بنەما شەرعییەکان و هێڵە گشتییەکانی کۆمەڵی ئیسـلامیی | چاپی یەك/٢٠١٢<br>چاپی سێ/٢٠١٤ | |
| ٢٩ | تەرجەمەی کوردیی عەقیدەی طــەحاویی | چاپی یەك/٢٠١٤ | |
| ٣٠ | ڕوونکردنەوەی عەقیدەی طەحـاویی | چاپی یەك/ ٢٠١٥<br>چاپی دوو/٢٠١٧ | |
| ٣١ | سیکۆلاریزم و دیموکراسیی لەئەزموونی کوردستاندا (دیبەیتی ساڵ) | چاپی یەك/٢٠١٦ | |
| | **فیقهـی ئیســلامیی** | | |
| | مەوسـووعەی: خواپەرستیی ئیسـلامیی (٤ بەرگ) | چاپی یەك/٢٠٠٠ ، چاپی دوو/٢٠٠٩ | |
| ٣٢ | بەرگی یەکەم: خواپەرستیی بەگشتیی، وردە بابەتە خیلافییەکان، پاكء خاوێنیی | | |
| ٣٣ | بەرگی دووەم: نوێژ بەرپاکردن یەکەمین درووشمی خواپەرستیی | | |
| ٣٤ | بەرگی سێیەم: زەکات و ماڵ بەخشین | | |
| ٣٥ | بەرگی چوارەم: ڕۆژو گرتن، حەج و عومرەکردن، زیکری خواکردن | | |
| ٣٦ | بنچینە گرنگەکانی هەڵسـەکەوتی شەرعییانەو ژیرانە لەگەڵ وردە بابەتە خیلافییەکاندا | چـاپی یەك/١٩٩٩ | بۆ زمانی عەرەبیش وەرگێـڕراوە |
| ٣٧ | جـەژن و یـادو بۆنەکان و هەڵسـەنگاندنێك | چـاپی یەك/٢٠١٣ | |

| | | | |
|---|---|---|---|
| ٣٨ | چەند بابەتێکی هونەریی لەبەر ڕۆشنایی قورئان و سوننەتدا | چاپی یەك/٢٠٠٩<br>چاپی دوو/٢٠١٥ | بۆ زمانی فارسییش تەرجەمە کراوە |
| ٣٩ | چەند بنەمایەکی گرنگی ماڵ و سامان بەخشین لەڕێی خوادا | چاپی یەك/٢٠١٣ | |
| | **تەزکیەی نەفس و ڕەوشت و ئاکار** | | |
| ٤٠ | یادی خوا، گرنگیی یادی خوا لە ژیانی مرۆڤدا | چاپی یەك/١٩٨٧ | |
| ٤١ | ڕێگای صاڵح بوون و بەرەو خوا چوون، تەزکیەی نەفس لەبەر ڕۆشنایی قورئان و سوننەتدا | چاپی یەك/١٩٩٠<br>چاپی پێنج/٢٠١٢ | وەرگێڕدراوە بۆ زمانی عەرەبی و فارسییش |
| ٤٢ | مزگەوتەکانی کوردستان لەنێوان ئاوەدانکردنەوەو وێرانکردندا | چاپی یەك/١٩٩٩ | |
| ٤٣ | گەڕانەوە بۆ لای خوا (سبحانە وتعالی)، بەرەو خوا وەرچەرخان، وازهێنان لە گوناهو سەرپێچیی و گۆڕانکاریی ڕیشەیی بەسەر خۆدا هێنان | چاپی یەك/٢٠٠١<br>چاپی پێنج/٢٠١٠ | |
| ٤٤ | شەهید کێیەو چ پلەوپایەیەکی هەیە ؟! | چاپی یەك/٢٠٠٢ | |
| ٤٥ | باسێك لەبارەی بینینی خوای بەرزو مەزن لەدنیاو دواڕۆژدا | چاپی یەك/٢٠١٥ | |
| ٤٦ | گیانی ژیان، باش خوا پەرستن و خۆ پاك و چاك کردن | چاپی یەك/٢٠١٥ | |
| ٤٧ | مەوسووعەی: ڕەوشت و ئاکاری ئیسلامیی لەبەر ڕۆشنایی قورئان و سوننەتدا | چاپی یەك/٢٠١٦ | |
| | **بانگەوازو کاری ئیسلامیی** | | |
| ٤٨ | کۆمەڵی خوا | چاپی یەك/١٩٨٨ | |
| ٤٩ | پێشمەرگەی ئیسلام، یان مسوڵمانی موجاهید کێیەو چۆنە؟ | چاپی یەك/١٩٨٨<br>چاپی سێ/١٩٩٨ | |
| ٥٠ | دەردو دەرمانی بزووتنەوەی ئیسلامیی | چاپی یەك/١٩٩٠ | |
| ٥١ | بزووتنەوەی ئیسلامیی لە دووڕیانی مان و نەماندا | چاپی یەك/١٩٩٣ | |

| | | | |
|---|---|---|---|
| ٥٢ | بزووتنەوەی ئیسلامیی و قۆناغی نوێی | چاپی یەك / ١٩٩٤ | |
| ٥٣ | چەند ڕێڕوونییەك بۆ ئیسلامییەکانی کوردستان | چاپی یەك / ١٩٩٧ | |
| ٥٤ | بزووتنەوەی ئیسلامیی و ئاسۆیەکی گەش و ڕوون، بنەما شەرعی یەکان و بنچینە ئەخلاقی یەکان | چاپی ١ / ١٩٩٧ | |
| ٥٥ | ئیسلام و کێشە هەنووکەیی یەکان | چاپی یەك / ١٩٩٨ | |
| ٥٦ | زانایانی ئیسلام کێن و چۆنن ؟! | چاپی یەك/ ٢٠٠٢<br>چاپی سێ / ٢٠١١ | وەرگێڕراوەتە سەر زمانی عەرەبی |
| ٥٧ | کۆمەڵی ئیسلامیی: ئامانج و هەڵوێستەکانی | چاپی یەك/ ٢٠٠٢ | |
| ٥٨ | چۆن هەڵسوکەوت لەگەڵ خەڵکی دا بکەین؟! | چاپی یەك / ٢٠٠٢ | وەرگێڕراوەتە سەر زمانی عەرەبی |
| ٥٩ | چۆن لە جیهاد بگەین؟ | چاپی یەك / ١٩٩٨ | |
| ٦٠ | جیهاد لە ڕێی خواداو چەند سەرنج و ئاگادارییەك | چاپی یەك/ ٢٠٠٢ | |
| ٦١ | بۆئەوەی لەسەر جیهادکردنمان قەرزدار نەبینەوە! | چاپی یەك / ٢٠٠٢ | |
| ٦٢ | جیهاد لە ڕێی خوادا چی یەو بۆچی دەکرێ و چۆن دەکرێ ؟ | چاپی یەك / ٢٠٠٢ | |
| ٦٣ | چەند ڕێڕوونییەك بۆ خوشك و برایانمان لە هەندەران | چاپی یەك/ ٢٠٠٢ | |
| ٦٤ | ئیسلام و مسوڵمانەتیی و کاری ئیسلامیی، لەبەر ڕۆشنایی قورئان و سوننەتدا | چاپی یەك/٢٠٠٦ | |
| ٦٥ | هاوپەیمانێتی لەبەر ڕۆشنایی قورئان و سوننەتدا | چاپی یەك / ٢٠٠٩ | |

| | | | |
|---|---|---|---|
| ٦٦ | بەشدارییکردن لە هەڵبژاردن و پەرلەماندا، هەڵسەنگاندنێکی شەرعییانەو ژیرانە | چاپی یەك / ٢٠٠٩<br>چاپی دوو / ٢٠١٣ | چاپی یەکەم بە دوو ئاڵقەی جیاوازو بە دوو ناوونیشانی جیاواز کراوە، بەم شێوەیە:<br>ئاڵقەی یەکەم: بەڵگەکانی ئەوانەی بەشداریکردن لە هەڵبژاردن و پەرلەماندا بەشەرعیی نازانن و هەڵوەشاندنەوەیان.<br>ئاڵقەی دووەم : بەڵگەکانی ڕەوایی بەشداریکردن لە هەڵبژاردن و پەرلەماندا |
| ٦٧ | هەڵوەشاندنەوەی بیروڕاو ڕەفتارە پەرگیرانەکانی ڕێکخراوی (داعش) | چاپی یەك/ ٢٠١٥<br>چاپی دوو/٢٠١٧ | وەرگێڕاوەتە سەر زمانی فارسیی |
| ٦٨ | با لادان و تاوانی پەرگیران، بەرانبەر بە ئیسلام نەمانخاتە دوودڵیی و گومان | چاپی یەك/٢٠١٥ | وەرگێڕاوەتە سەر زمانی فارسیی |
| ٦٩ | پەرگیریی: پێناسەی، نیشانەکانی پەرگیران، هۆکارەکانی پەرگیریی، شوێنەوارو دەرهاوێشتەکانی، چارەسەری | چاپی یەك/ ٢٠١٥ | وەرگێڕاوەتە سەر زمانی فارسیی |
| | زنجیرەی بنەما شەرعییەکانی کۆمەڵی ئیسلامیی | | |
| ٧٠ | ئاڵقەی یەکەم: بەڵگە شەرعیجیەکانی بنیاتنانی کۆمەڵی ئیسلامیی | چاپی یەك / ٢٠٠١ | |
| ٧١ | ئاڵقەی دووەم و سێیەم: حوکمی لادانی خەلیفەو کاربەدەستانی مسوڵمان لەکاتی لاریی و ستەمکارییدا | چاپی یەك / ٢٠٠١ | |
| ٧٢ | ئاڵقەی چوارەم : شێخ ئەبو بەصیرو هەڵسەنگاندنێکی شەرعی یانەو ژیرانەی فەتوانامەکەی | چاپی یەك / ٢٠٠١ | |
| | وتاری کۆنگرەکانی کۆمەڵی ئیسلامیی کوردستان | | |
| ٧٣ | کارو پڕۆژەی ئیسلامییمان (وتاری کۆنگرەی یەکەمی کۆمەڵی ئیسلامیی) | چاپی یەك/٢٠٠٥<br>چاپی دوو/ ٢٠٠٦ | |

| ژ | ناونیشان | چاپ | |
|---|---|---|---|
| ٧٤ | ڕاپۆرتی : ئیمانیی، فیکریی، سیاسیی کۆمەڵی ئیسلامیی کوردستان (وتاری کۆنگرەی دووەمی کۆمەڵی ئیسلامیی) | چاپی یەك/٢٠١٠ | |
| ٧٥ | چاوپێداگێڕانەوەیەکی بارودۆخی نێوخۆمان و واقیعی دەرەکییمان (وتاری کۆنگرەی سێیەمی کۆمەڵی ئیسلامیی)، ٣٠ /٥/ ٢٠١٥ | چاپی یەك/٢٠١٦ | |
| | **نەتەوایەتیی و مەسەلەی کورد** | | |
| ٧٦ | کوردستان بۆ وێران بوو و چۆن ئاوەدان دەبێتەوە؟! | چاپی یەك / ١٩٨٩ | |
| ٧٧ | حوکمی گەڕانەوە ژێر نیری طاغوت لە ڕوانگەی ئیسلامەوە | چاپی یەك/١٩٩٠<br>چاپی دوو/٢٠٠٥ | |
| ٧٨ | سۆزی نەتەوایەتیی و بیری ناسیۆنالیزم لە تەرازووی ئیسلامدا | چاپی یەك/١٩٩٠<br>چاپی سێ/٢٠٠٥ | |
| ٧٩ | چارەسەری کێشەی کورد لە نێوان ئیمان و پەرلەماندا | چاپی یەك/١٩٩٢ | |
| | **سیاسەت و حوکمڕانیی** | | |
| ٨٠ | چەند بابەتێکی سیاسیی هاوچەرخ لەبەر ڕۆشنایی عەقڵ و وەحییدا | چاپی یەك / ٢٠١٠ | |
| | مەوسووعەی: ئیسلام و دەوڵـەتداریی، (٤ بەرگ) | چاپی یەك / ٢٠١٤-٢٠١٦ | |
| ٨١ | بەرگی یەکەم: قەوارەی سیاسیی لەئیسلامدا: بەڵگەکانی پێویستبوونی، چۆنیەتی بنیاتنانی، سروشت و بناغەی فیکریی، پێناسەی چەند وشەو زاراوەیەك | | |
| ٨٢ | بەرگی دووەم: بنەمایەکانی سیستمی حوکمڕانیی لەئیسلامدا | | |
| ٨٣ | بەرگی سێیەم: (سێ دەستەڵاتەکان):<br>یاسادانان ، جێبەجێکردن ، دادوەریی | | |
| ٨٤ | بەرگی چوارەم: نا مسوڵمانان لە کۆمەڵگاو دەوڵەتی ئیسلامییدا | | |
| ٨٥ | ڕوانینێکی ئیسلامییانە بۆ واقیعی ئێستامان | چاپی یەك/٢٠١٧ | |
| | **ئافرەت و خێزان** | | |
| ٨٦ | ئافرەتی مسوڵمانی کورد، مافە شەرعییەکانی و ئەرکە گرنگەکانی | چاپی یەك / ٢٠٠٣ | |

| | | | |
|---|---|---|---|
| ٨٧ | مەوسووعەی : ئافرەت و خێزان لە سایەی شەریعەتدا | بەرگی یەکەم چاپی یەك/٢٠٠٢<br>بەرگی یەك و دوو چاپی سێ/٢٠١٣ | |
| | **مێژوو** | | |
| ٨٨ | پوختەی ژیاننامەی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم، دەرس و پەندەکانی | چاپی یەك/٢٠٠٩<br>چاپی سێ/٢٠١٣ | |
| ٨٩ | چەند مەلۆیەك لە خەرمانی تەمەنم (بیرەوەرییەکانم)، بەشی یەکەم (١٩٦١-١٩٩١) | چاپی یەك/٢٠١٥ | |
| ٩٠ | بەرکولێکی کاروچالاکیی و ڕووداو و وێستگەکانی ژیانم | چاپی یەکەم/٢٠١٨ | |
| | **دیدارو گفتوگۆ** | | |
| ٩١ | سنووره قەدەغەکان مەشکێنن! (چاوپێکەوتنی دکتۆرحسین محمد عزیز) | چاپی یەك/٢٠٠١<br>چاپی دوو/٢٠٠٤ | |
| ٩٢ | ئەشکەنجەو زیندان، پێشمەرگەیەك بیست و دوو مانگ لە زیندانی داگیرکەردا | چاپی یەك / ٢٠٠٥<br>چاپی سێ/ ٢٠٠٩ | وەرگێڕراوەتە سەر زمانی عەرەبی، هەروەها دوو تەرجەمەی فارسیشی کراوەو چاپ و بڵاوکراوەتەوە، هەروەها بۆ زمانی ئینگلیزیش وەرگێڕراوەو چاوەڕێی چاپە |
| ٩٣ | گەنج لە چەمکە هەنووکەییەکاندا | چاپی یەك /٢٠١٠ | |
| | **زنجیرەی بابەتە هەنووکەییەکان** | | |
| ٩٤ | گەنجەکانمان لە نێوان ڕەسەنایەتیی و لاسایی کردنەوەدا (١) | چاپی یەك/ ٢٠٠٦ | بۆ زمانی فارسییش وەرگێڕراوە |
| ٩٥ | با وریا بین ! داڕووخانی ڕەوشت کۆمەڵگاکەمان بەرەو هەڵدێر دەبات (٢) | چاپی یەك / ٢٠٠٢<br>چاپی دوو/ ٢٠٠٦ | |
| ٩٦ | بەدوورخستنەوەی ئافرەت لە ئیسلام چ زیانێك دەکەین؟! (٣) | چاپی یەك / ٢٠٠٧ | |
| ٩٧ | چۆنیەتی بوونە پێشەنگ و بنیاتنانی بنکەی جەماوەریی (٤) | چاپی یەك / ٢٠٠٧ | |

| | | | |
|---|---|---|---|
| ٩٨ | سیاسەتی ئیسلامیی و چەند ڕوونکردنەوەیەك (٥) | چاپی یەك / ٢٠٠٧ | |
| ٩٩ | چەند بنەمایەکی گرنگی وتاربێژیی (٦) | چاپی یەك / ٢٠٠٦ | بۆ زمانی فارسییش وەرگێڕراوە |
| ١٠٠ | قوتابیانی زانیاری شەرعیی و چەند سەرنج و ڕێنمایی یەك (٧) | چاپی یەك / ٢٠٠٧ | |
| ١٠١ | خوو ڕەوشتی بەرزو پەسند سەنگی مەحەکی مسوڵمانەتییە (٨) | چاپی یەك / ٢٠٠٧ | |
| ١٠٢ | بانگەواز بۆ لای خودا، چی یەو چۆنەو بە کێ دەکرێ؟ (٩) | چاپی یەك / ٢٠٠٧ | بۆ زمانی فارسییش وەرگێڕراوە |
| ١٠٣ | قوتابیان لەم هەل و مەرجەدا، پێویستە چۆن بن و چی بکەن ؟! (١٠) | چاپی یەك / ٢٠٠٨ | |
| ١٠٤ | واقیعی هەرێمی کوردستان، دیدێکی ئیسلامییانە (١١) | چاپی یەك / ٢٠٠٨ | |
| ١٠٥ | سروشت و پایەکانی خێزان و مەسەلەی چەندژنیی لە تەرازووی شەرع و عەقڵدا (١٢) | چاپی یەك/٢٠٠٩ | ئەم نامیلکەیە بە(١٤) ئاڵقە لە ڕۆژنامەی (ڕۆژنامە)دا بڵاوکراوەتەوە |
| ١٠٦ | کاری ئیسلامیی و ڕەواندنەوەی چەند تەمومژێك (١٣) | چاپی یەك / ٢٠١١ | |
| ١٠٧ | حوکمی لە ئیسلام هەڵگەڕانەوەو هەڵسەنگاندنێك (١٤) | چاپی یەك/ ٢٠١١ | |
| ١٠٨ | مەلای گەورەی کۆیەو تەفسیرەکەی و چەند سەرنجێك (١٥) | چاپی یەك / ٢٠١١ | |
| ١٠٩ | لێکۆڵینەوەیەك لەبارەی : هەبوون و نەبوونی نەسخ لە قورئاندا (١٦) | چاپی یەك / ٢٠١٢ | |
| ١١٠ | تاقیکردنەوەی خوا بۆ بەندەکانی چی یەو چۆنە؟ (١٧) | چاپی یەك/ ٢٠٠٣<br>چاپی دوو/ ٢٠١٢ | |
| ١١١ | ڕەوەندی کورد لە هەندەران و ئەرکی سەرشانی (١٨) | چاپی یەك / ٢٠١٢ | |
| ١١٢ | خاتوون مەلاژن : ئافرەتێکی هەڵکەوتوو و هاوسەرێکی ناوازە (١٩) | چاپی یەك / ٢٠١٢ | |

| ژ | ناونیشان | چاپ | تێبینی |
|---|---|---|---|
| ١١٣ | گەنج و قەیرانی ڕووحیی: هۆکار، شوێنەوار، چارەسەر (٢٠) | چاپی یەك ٢٠١٧ | |
| ١١٤ | ژیان لەسایەی ئیمانداو ڕەواندنەوەی گومانەکان (٢١) | چاپی یەك/ ٢٠١٧ | |
| | **ب- کتێبە عەرەبییەکان** | | |
| ١١٥ | موسوعة : الإســلام كما يتجلّى فى كتاب الله | ط الاولى/٢٠١٥ | کە لە چاپی یەکەمدا (٨) بەرگەو، لە چاپی دووەمیدا لە (١٢) کتێبدا دەبێ، بەم شێوەیە: |
| ١١٦ | الكتاب الأول: الإسـلام: معرفة صحيحة بالخـالق عز وجل والخلـق | ط الثانية/٢٠١٦ | |
| ١١٧ | الكتاب الثاني: تعريف الإيمـان | ط االثانية/٢٠١٧ | |
| ١١٨ | الكتاب الثـالث: الإيمان بالله تبارك وتعالـى: الخالق الرب الـمالك الإله ذي الأسـماء الحسـنى والصفات العلى | ط الثانية/٢٠١٧ | |
| ١١٩ | الكتاب الرابــع: الإيمان بالـملائكة و بالـجـن | ط الثانية/٢٠١٧ | |
| ١٢٠ | الكتاب الخامس: الإيمان بكـتب الله الحكـيم | ط الثانية/٢٠١٧ | |
| ١٢١ | الكتاب الســادس: الإيمان برسـل الله تعالـى وأنبيـائه الكـرام | ط الثانية/٢٠١٧ | |
| ١٢٢ | الكتاب الســابـع: خاتم النبيين محمد صلى الله علية وسلم: موجز سـيـرته وبراهين نبـوّتـه | | |
| ١٢٣ | الكتاب الثامن: الإيمان باليوم الآخر وموجز عن القدر | | |
| ١٢٤ | الكتاب التاسـع: إهتداء الإنســان بهـدى الله، أو الإلتزام الفردي بشــريعة الله | | |
| ١٢٥ | الكتاب العاشـر: إلتزام الـمجتمع بشريعة الله تعالـى | | |
| ١٢٦ | الكتاب الحـادي عشـر: تطبيق الـمجتمع للشـريعة و معــالم الدولة فـي الإســلام | | |
| ١٢٧ | الكتاب الثاني عشــر: الإســلام: نظـرة سـديدة تجـاه الناس وتعامل صحيح معهم | | |
| ١٢٨ | نقض فـكــرة التطــرف | "ط الاولى/٢٠١٦-لندن-، ط الثانية/ ٢٠١٧، -القاهرة (نقض التطرف ودحض أفكار المتطرفين)" | |
| ١٢٩ | ضـيف و قضـية (مقابلة مع قنـاة العربية) | ط الاولى/٢٠٠٦ | |
| ١٣٠ | لقاء خاص (مقابلـة مع قنـاة العـالم) | ط الاولى/٢٠٠٦ | |

| | | | |
|---|---|---|---|
| ١٣١ | حديث مختصر حول مايجري على الساحة العراقية | ط الاولى/ ٢٠١٦ | |
| ١٣٢ | طريق الصلاح والسير الى الله / تزكية النفس في ضوء القرآن والسنة | ط الاولى/٢٠١٢ | |
| ١٣٣ | أمير وراء القضبان | ط الاولى/ ٢٠٠٩ | |
| ١٣٤ | مسائل عصرية رائجة | ط الثانية/٢٠١٤ | |
| ١٣٥ | قواعد مهمة في التعامل الشرعي الحكيم مع المسائل الفرعية الخلافية | ط الاولى/ ٢٠١١ | |
| ١٣٦ | علماء الإسلام من هم وماهي صفاتهم؟ | ط الاولى/ ٢٠٠٥ | |
| ١٣٧ | الأُصول الشرعية والخطوط العامة للجماعة الإسلامية | ط الاولى/ ٢٠١٢ | |
| ١٣٨ | كيف نتعامل مع الناس؟ | ط الأولى/٢٠٠٢ | |
| ١٣٩ | حوارات ساخنة حول قضايا راهنة، في ميادين الفكر والفقه والدعوة والسياسة | ط الاولى/٢٠١٨ | |
| | ئەو کتێبانەی لەژێر چاپن | | |
| ١٤٠ | تەفسیری قوڕئانی بەرزو بەپێز، بەرگی دەیەم: سووڕەتی: (هود) | | |
| ١٤١ | تەفسیری قوڕئانی بەرزو بەپێز، بەرگی یازدەیەم: سووڕەتی: (یوسف) | | |
| | مەوسووعەی: بیرکردنەوەی ئیسلامیی لەنێوان وەحیی و واقیعدا | | |
| ١٤٢ | بەرگی یەکەم: ڕوونکردنەوەی چەمك و چییەت و سەرچاوەکان و گرنگیی: بیرکردنەوەی ئیسلامیی | | |
| ١٤٣ | بەرگی دووەم: هێڵە گشتییەکانی ڕێبازی جەماوەری مسوڵمانان | | |
| ١٤٤ | بەرگی سێیەم: تەوژمە فیکرییە سیاسییەکانی مێژووی مسوڵمانان | | |
| ١٤٥ | بەرگی چوارەم: پایەکانی بیرکردنەوەی ئیسلامیی | | |
| ١٤٦ | بەرگی پێنجەم: چەند پرسێکی فیکریی هەنووکەیی جۆراوجۆر | | |
| ١٤٧ | قوڕئان و پاکسازیی و چاکسازیی لە هەرێمی کوردستاندا | | |

# وێنەی بەرگی
# هەندێك لە بەرهەمەکان







www.alibapir.net

# نێوەڕۆك

عەلی باپیر

بەرکولێکی کاروچالاکیی و ڕووداوەکانی

ژیانم

ئەم کتێبە :

ژمارەیەکی بەرچاوی کاروچالاکیی و وێستگە سەرەکییەکانی ژیان و گوزەرانمی هەر لەکاتی لەدایکبوونمەوە تا ئێستا، تێدا خراونە ڕوو، بەڵام بەکورتیی و گوشراویی و ئاماژە ئاسا.

بۆیە دەتوانم بڵێم :

ئەم کتێبە هێڵە گشتیی و هەڵوێستە بەرجەستەکانی ژیان و تەمەنمی گرتوونە خۆی، بەتایبەت لەڕووی: فیکریی و سیاسییەوە...